# ڕێگاکانی وانەگوتنەوە

سامان مام عەبدوڵڵا



# ڕێگاکانی گوتنەوەی وانەی ڕێنووس

نووسەر :سامان مام عەبدوڵلا
بابەت : پەروەردەیی
دیزاین : دەزگای ڕوانگە
هەڵەچن : عوف عبدالرحمان عبدالله
چاپ : یەکەم ٢٠٢١
تیراژ : ١٠٠٠ دانە
چاپخانە : چاپخانەی ماڵی ڕاستی

لە بەڕێوەبەریەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٨٢٨)ی ساڵی (٢٠٢١)ی پێ دراوە.

سامان مام عەبدوڵلا

# ڕێگاکانی گوتنەوەی وانەی ڕێنووس

هەولێر- نیسانی ٢٠٢١

## ناوەڕۆك



### بەشی یەکەم/ ڕەهەندەکانی توێژینەوە

**بەشی دووەم/ کاریگەریی شێوازەکانی وانەگوتنەوە لە سەر مامۆستا و قوتابی، لە دیدی ڕۆشنبیرانی (٨) وڵاتدا**



**بەشی سێیەم/ ڕێنماییە دەروونی و پەروەردەییەکان بۆ سەرخستنی ڕێگاکانی وانەگوتنەوەی سەردەمییانە**

**بەشی چوارەم/ جۆرەکانی ڕێنووس لە بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتیدا**

**بەشی پێنجەم/ ڕێگاکانی گوتنەوەی ڕێنووس لەبازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتی**



**بەشی شەشەم/ هەندێ لایەنی نووسین و دەنگسازی**

**بەشی حەوتەم/ خاڵبەندی**

## سوپاس و پێزانین

سوپاس بۆ خوای گەروە و باڵادەست کە هێز و توانای پێ دام بۆ نووسینی ئەم کتێبە

سوپاس بۆ

دایك و باوکم

د. ئاوات محەمەد ئەمین قەرەداغی

د. جەمال سلێمان

م. ئیحسان صابر

م. هۆشەنگ کانەبی

م. سەلام ئەحمەد

م. ڤینۆس صابر

کۆژین محەمەد

سەنتەری پێداگۆجی زانکۆی سەلاحەدین - هەولێر

## پێشەكی

ڕێگاكانی وانەگوتنەوە بریتییەی لە گرتنەبەری ئەو شێوازە گونجاوانەی كە بۆ گەیاندنی ئەزموون و بیرۆكەكانی بە ئاسانترین و باشترین شێواز یارمەتیی مامۆستا دەدات، بۆ ئەوەی لەگەڵ بیر و بیركردنەوەی سەردەمیانەی قوتابی و كۆمەڵگە بگونجێت.

لەگەڵ پێشكەوتنی كۆمەڵگە بیركردنەوەی مرۆڤەكانیش پێش دەكەوێت، بەكارهێنانی زیاتر لە ڕێگایەك بۆ وانەوتنەوە هۆكارێكی كاریگەرە بۆ ئەوەی مامۆستا بتوانێت بیرۆكە و ئەزموونی خۆی لەگەڵ ئەو بابەتەی لەناو كتێبدا هەیە بە باشترین و ئاسانترین شێواز بیگەیەنێت بە قوتابی.

مامۆستای سەركەوتوو ڕێگای وانەگوتنەی سەركەوتوو و سەردەمییانە هەڵدەبژێرێت بۆ ئەوەی زۆرترین سوود بە قوتابییەكانی بگەیەنێت، هەڵبژاردنی ڕێگایەكی نوێ و دروست بۆ وانەگوتنەوە گرینگە بۆ گەیاندنی مەبەست و بیرۆكەی سەرەكی، لەگەڵ ئەوەشدا گرینگە بۆ ئەوەی مامۆستا پۆلی وانەوتنەوە كۆنتڕۆڵ بكات و كەشێكی گونجاو و ئارام بڕەخسێنێت.

بۆ ئەوەی مامۆستا لە وانەگوتنەوە و پیشەی مامۆستایەتیدا سەركەوتن بەدەست بهێنێت، دەبێت ڕەچاوی سەرجەم ڕێگاكانی وانەگوتنەوە بكات، نابێت مامۆستا تا كۆتایی ساڵ و وەرز پشت بەیەك ڕێگای وانەگوتنەوە ببەستێت، بەڵكو دەبێت ڕێگای جۆراوجۆر بگرێتە بەر، بەكارهێنانی ڕێگای جۆراوجۆر وا دەكات قوتابی و مامۆستا ببن بەتەوەری سەرەكی، نەك تەنها یەكێكیان، لە لایەكی تر ڕێگای جۆراوجۆر چێژ و خۆشی بە وانەكە دەدات.

## باڵداری دووەم کێیە؟

ئیبراهیم ئەمین باڵدار لە ڕێگای پەرتووکەکەی خزمەتێکی زۆری زمانی کوردی کردووە، جێگای ئاماژە پێدانە ئەم پەرتووکە دەیان نەوەی ئەکادیمی و سەردەمیی پێگەیاند، کە بوونە جێگای شانازی.

باڵداری دووەم کێیە؟ دکتۆر ئیبراهیم قادر جاف باڵداری دووەمە، لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٩ بۆ یەکەم جار چاوم بە ناوبراو کەوت.

سەرەتای چاوپێکەوتنمان لە بەشی کوردی- کۆلێژی پەروەردەی بنەڕەتی بوو، ئەوکات خەریکی گواستنەوەی خوێندن بووم لە زانکۆی سۆران بۆ زانکۆی سەلاحەدین، د.ئیبراهیم تا بڵێی تووڕە و توند دەهاتە بەرچاو، لەبەر ئەوەی تووڕە دەهاتە بەرچاو، زۆر بە وریاییەوە مامەڵەم لەگەڵی دەکرد، بەڵام کاتێك لەگەڵی دانیشتم و گفتوگۆم لەگەڵی کرد، چەند پرسیارێکی ئاڕاستە کردم.

بۆچی دەتەوێ بێیتە ئێرە؟

ئەگەر زیرەك نەبیت تۆم ناوێت؟

دەترسام لێم تووڕە بێت و قەبووڵم نەکات، لەگەڵ ئەوەشدا بە ترسەوە وەڵامی پرسیارەکانم دایەوە، سەیرێکی کردم و ڕەزامەندیی لە سەر وەرگرتنم دا، دواتر وتی دەبێت زیرەك بیت.

دواتر بەدەم واژۆکردنەوە دەستی کرد بە گفتوگۆ و قسەی خۆش، جار جارە پێدەکەنی، ئیتر لە دوای ئەو ڕۆژە دکتۆر ئیبراهیم بووە مامۆستای من و وانەی ڕێگاکانی وانەگوتنەوەی پێ دەگوتم.



بەبیرم دێت لە بابەتی ئاسانەوە دەستیپێکرد، وردە وردە دەچووە قوڵایی بابەتەکە، لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگار ئەم بابەتەم خۆش ویست و هەوڵی فێربوونی زیاترم دەدا، کتێبی جۆراوجۆرم لە سەر ئەو بابەتە دەخوێندەوە، ئەمە وای کرد شارەزایی باش پەیدا بکەم.

لەم بابەتەدا بەردەوام هەستم بە بەرەوپێشچوونی خۆم دەکرد، لە دواییدا بۆ ساڵی دواتر د. هەڤاڵ حوسێن هەمان ئەرك و بەرپرسیاریەتیی دکتۆر ئیراهیمی گرتە ئەستۆی خۆی و لە سەر هەمان ڕێگا بە شێوازی تازە و ئەکادیمی بابەتەکانی بۆ ڕاڤە دەکردین.

دکتۆر ئیبراهیم وانەی داڕشتنی گرتە ئەستۆ، ئیتر ئەمە سەرەتایەکی قورس بوو، چونکە دەبوایە هەوڵی نووسین و بیرکردنەوە بدەم، ئەوکات دەستی نووسین و بیرکردنەوەم باش نەبوو.

نەم دەتوانی لە شتەکان ڕابمێنم و بیر و بۆچوونی خۆمیان لە سەر دەرببڕم، بەڵام د. ئیبراهیم وەك هەموو جارەکانی تر لە ئاسانەوە بۆ گران لە بەشەوە بۆ گشت دەستیپێکرد.

لە ڕێگای پێشاندانی وێنەی ڕەنگاوڕەنگ و جیاواز هەوڵی دەدا بیر بکەینەوە و بابەتەکان بە بیر و بۆچوونی خۆمان دابڕێژین، ئیتر وردە وردە فێر بووم بیر بکەمەوە، لە هەمان کاتیشدا بیرەکانم لە چوارچێوەیەکی ئەکادیمی ڕێکبخەم و بیکەم بە نووسین.

بەبیرم دێت ڕۆژێك وێنەیەكی هێنا كۆمەڵێك ئاژەڵی تێدابوو، گوتی سەیری ئەم وێنەیە بكەن و بیروبۆچوونی خۆتانی لە سەر دەرببڕن، ئەوە یەكەم هەنگاوی دەستكردن بەنووسین بوو، ئەو هەنگاوە سەرەتاییە بۆ من بوو بە هەموو شتێك و فێری كردم بیربكەمەوە و بنووسم و ببم بە نووسەر.

ئێستا من خاوەنی كتێبێكم بە ناونیشانی (هەڵسەنگاندنی كاری خۆبەخشی لەنێو گەنجانی كۆمەڵگەی كوردیدا)، بڕیارم دا بۆ پێشبڕكێی كتێبەكانی ڕوانگە بەشداری بكەم و دەست بۆ بابەتێكی گرینگ ببەم بۆ خزمەتی پەروەردە و فێركردن.

لە كۆتاییدا زۆر سوپاسی دكتۆر ئیبراهیم قادر جاف و دكتۆر هەڤاڵ حوسێن دەكەم، كە فێریان كردم بیربكەمەوە و بیركردنەوەكانم لە چوارچێوەی وشە و ڕستەی جوان دەرببڕم و ببم بە كەسێكی خزمەتكار بۆ زانست و پەروەردە.

سامان مام عەبدوڵڵا

٢٩ ی ١ ی ٢٠٢١



## پوختەی توێژینەوە

ئەم توێژینەوەیە گرینگی بە ڕێگا و شێوازەكانی وانەگوتنەوەی سەردەمییانە دەدات، لەم چوارچێوەیەشدا ڕێگاكانی گوتنەوەی ڕێنووس دەگرێتە خۆی.

ئامانجی ئەم توێژینەوەیە بریتییە لە ڕەچاوكردنی سەرجەم ڕێنماییە پەروەردەیی و دەروونییەكان بۆ فێربوون، هەروەها هەڵبژاردنی باشترین شێواز بۆ گوتنەوەی ڕێنووس لە بازنەی یەكەمی قۆناغی بنەڕەتیدا، ئەم قۆناغە زۆر گرینگ و كاریگەرە بۆ قوتابی، چونكە بناغەی قوتابی بۆ خوێندنەوە و نووسین و ڕێنووس لەم قۆناغەدا دەست پێدەكات.

ئەگەر لە بازنەی یەكەمی خوێندندا قوتابی پێنەگەیەنرێت و لێكدان و شیكردنەوە و ڕووتەڵكردنی پیتەكانی فێر نەكرێت، ئەستەمە لە قۆناغەكانی تر فێر ببێت، چونكە ڕاستەوخۆ لە قوتابییەكانی هاوشانی خۆی دوادەكەوێت.

لە میتۆدی ئەم توێژینەوەیە، ڕێگای وەصفی و چاوپێكەوتن بەكار هاتوون، چاوپێكەوتن لەگەڵ كۆمەڵێك گەنج كراوە كە لە (سوید، ئوردن، توركیا، ئێران، بەڕازیل، ئیماراتی عەرەبی، پاكستان، هەرێمی كوردستان)، بازنەی یەكەمی قۆناغی بنەڕەتییان خوێندووە، ئەم چاوپێكەوتنە بۆ ئەوەیە باس لەم شێواز و ڕێگایانە بكەن كە مامۆستاكانیان لە بازنەی یەكەمی قۆناغی بنەڕەتی بەكاریان هێناون، لەگەڵ ئەوەشدا ڕەخنە و پێشنیازیان بخەنە ڕوو بۆ چاككردنی شێوازی وانەگوتنەوە و گونجانی لەگەڵ سەردەمی

ئێستادا.

بە شێوەیەکی گشتی ئەم توێژینەوەیە لە شەش بەشی سەرەکی پێك دێت، بەشی یەکەم: ڕەهەندەکانی توێژینەوەیە، کە هەریەکە لەم تەوەرانە لەخۆ دەگرێت (ناونیشانی توێژینەوە، سنووری توێژینەوە، گرینگیی توێژینەوە، کێشەی توێژینەوە، ئامانجی توێژینەوە، ڕێبازی توێژینەوە)، لەگەڵ ئەوەشدا بەشی دووەم پێك دێت لە: کاریگەریی شێوازی وانەگوتنەوە لە سەر مامۆستا و قوتابی لە دیدی ڕۆشنبیرانی ٨ وڵاتدا، بەشی سێیەم پێك دێت لە: ڕێنماییە دەروونی پەروەردەییەکان بۆ سەرخستنی ڕێگاکانی وانەگوتنەوەی سەردەمی، بەشی چوارەم پێك دێت لە: جۆرەکانی ڕێنووس لە بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتیدا، هەرچی بەشی پێنجەمە ڕێگاکانی گوتنەوەی ڕێنووس لە بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتی لە خۆ دەگرێت، بەشی شەشەم هەندێ لایەنی نووسین و دەنگسازی لەخۆ دەگرێت و بەشی حەوتەم لە خاڵبەندی پێك دێت، لە کۆتاییدا ڕاسپاردە و ئەنجام و لیستی سەرچاوەکان داندراوە.



## خلاصة البحث

يهتم هذا البحث بأنواع طرق التدريس المعاصر وأشكاله، وهذا الإطار ينطوي على طرق تدريس الإملاء.

هدف هذا البحث هو الأخذ بجميع طرق التعليم التربوية والنفسية للتعلم بنظر الاعتبار، وكذلك تحديد أفضل الأشكال التدريسية للكتابة الإملائية في الإطار الأول للمرحلة الاساس، فلهذه المرحلة أهمية بالغة وفعالة للتلميذ، لأنها أساس التلميذ في القراءة والكتابة، وتبدأ الكتابة الإملائية أيضاً في هذه المرحلة.

فإن لم ينشأ الطالب في هذه المرحلة على سبل الضرب والتحليل والتعرف على الحروف، فمن الصعب أن يتعلمها في المراحل الأخرى، لأنه سيتأخرعن زملائه في نفس المرحلة بشكل مباشر.

ضمن هذا البحث استخدمنا الطريقتين الوصفية والمقابلة، المقابلة مع مجموعة من الشباب في (السويد، الأردن، تركيا، إيران، الإمارات العربية، البرازيل،ب اكستان، وإقليم كوردستان) فهم مارسوا الحلقة الأولى من المرحلة الأساس، الغرض من هذه المقابلات كان التحدث عن الطرق والأشكال التي مارسها المعلمون في الحلقة الأولى من المرحلة الأساس، وإضافة الى ذلك طرح انتقاداتهم لتعديل وإصلاح نوعية التدريس وملاءمته مع عصرنا هذا.

وبشكل عام يتكون هذا البحث من ستة أقسام رئيسة: القسم

الأول: أبعاد البحث، الذي يضم في نفسه هذه المحاور [عنوان البحث، أفق البحث، مشاكل البحث، أهمية البحث، أهداف البحث، مسارالبحث] أما القسم الثاني فيتكون من: أثر أشكال التدريس على المعلم والتلميذ من منظور سبع دول، والقسم الثالث يتكون من: التعليمات النفسية والتربوية لنجاح طرق التدريس المعاصر، أما القسم الرابع فيتكون من أنواع الإملاء في الحلقة الأولى من المرحلة الأساس، ولكن القسم الخامس يضم طرق تدريس الإملاء في الحلقة الأولى من المرحلة الأساس، والقسم السادس يتكون من مجموعة من جوانب الكتابة والمصوتات، والقسم السابع يتكون من علامات الترقيم، وفي النهاية جاءت توصيات ونتائج وقوائم المصادر.




## Abstract

This study concerns with the methods and ways of modern teaching, in this regard, the methods of teaching spelling have been highlighted. The aim of this study considers all the educational and psychological guidance for learning. It also, the best possible way has been chosen for teaching spelling in the first circle of basic grades. This grade is substantially important and effective for students since the foundation of students for reading, writing and spelling has been started in this stage.

If the students have not taught multiplication, division, analysis and distinguishing the letters in the first circle, it is impossible they learned in the other stages because they will fall behind from their colleagues. The descriptive and interviewing method have been used in this study, the interviews were conducted with a number of young people in (Sweden, Jordan, Turkey, Iran, Brazil, Pakistan, Kurdistan Region), in the first circle, they have studied basic stages, the interview is for discussing about

the methods and ways that the teachers have used. Moreover, they were given opportunity to provide constructive feedback, update the methodology and being compatible with modern teaching. In general, this study consists of six main sections:

The first section: the elements of the study, each part includes (the title of the research, the scope of the study, the significance of the study, the problem of the study, the aims of the study, research methodology), the second section includes: The impact of the methods of teaching on teachers and students by the perspective of educators of seven countries. The third section is about the psychological and educational guidance to foster the modern methodology. The fourth section includes: the types of spelling in the first circle in the basic grade. The fifth section includes the methods of teaching of spelling in the first circle. The sixth section includes some sides of writing and phonetics. The seventh section includes punctuation marks. The study ends with some recommendations, conclusions and reference list.



## بەشی یەکەم

## ڕەهەندەکانی توێژینەوە

ناونیشانی توێژینەوە

سنووری توێژینەوە

گرینگیی توێژینەوە

کێشەی توێژینەوە

ئامانجی توێژینەوە

ڕێبازی توێژینەوە

## ناونیشانی توێژینەوە

ئەم توێژینەوەیە لە ژێر ناونیشانی (ڕێگاکانی گوتنەوەی وانەی ڕێنووس)ە، گرینگی و بایەخی ڕێنووس بۆ قوتابییان و مامۆستایانی قۆناغی بنەڕەتی دەخاتە ڕوو، گرینگترین بەشی ئەم توێژینەوەیە بریتییە لە وەرگرتنی نموونەی بەردەستی ٧ وڵاتی جیاواز و تیشکخستنە سەر خاڵبەندی و جۆرەکانی ڕێنووس، لەگەڵ ئەوەشدا چۆنییەتیی گوتنەوەی جۆرەکانی ڕێنووس بۆ قۆناغە جیاوازەکانی بازنەی یەکەم لە قۆناغی بنەڕەتی دەخاتە ڕوو.

## سنووری توێژینەوە

سنووری ئەم توێژینەوە لە چوارچێوەی بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتیدایە، بە مەبەستی تیشکخستنە سەر شێوازە نوێیەکانی گوتنەوەی ڕێنووس و گرینگی و تایبەتمەندییەکانی بۆ قوتابییان لە قۆناغە جیاجیاکانی خوێندندا.

## گرینگیی توێژینەوە

لێکۆڵینەوە دەربارەی ڕێنووس گرینگی و تایبەتمەندیی خۆی هەیە، چونکە ڕێنووس یەکێکە لە بنەما گرینگەکانی نووسین، کە بریتییە لە ڕاهێنانی دروست لە سەر نووسین و حونجەکردن، بە شێوەیەکی گشتی بەشێك لە مامۆستایان ناتوانن بە دروستی وانەی ڕێنووس بە قوتابییان

بڵێینەوە، هەندێکیان گرینگی بەوانەی ڕێنووس نادەن و بەهەندی وەرناگرن، لەگەڵ ئەوەشدا ڕێنووس لایەنێکی گرینگە بۆ نووسین.

### کێشەی توێژینەوە

بە درێژایی ئەم توێژینەوەیە کاتێك باسی ڕێنووس و چەمکی ڕێنووسمان کردووە. ئەوەی ئاشکرا و ڕوونە تا ئێستا بە شێوەیەکی بەربڵاو و جیاواز لە توێژینەوەی جیاوازدا باس لە گوتنەوەی ڕێنووس دەکرێت و تێڕوانینی جیاواز لە سەر شێوازەکانی گوتنەوەی ڕێنووس هەن، بە شێوەیەکی گشتی مامۆستا لە گوتنەوەی ڕێنووسدا قۆناغەکان تێکەڵ دەکەن، ئەمەش دەبێتە هۆی سەرلێشێوانی قوتابی و تێکەڵکردنی نووسین و جیانەکردنەوەی وشە و پیت، بەڵام لەم توێژینەوەیەدا هەوڵمان داوە هەموو لایەنە گرینگەکانی گوتنەوەی ڕێنووس لە بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتی بخەینە ڕوو.

### ئامانجی توێژینەوە

هەموو توێژینەوەیەك ئامانجی دیاریکراوی هەیە و بۆ مەبەستی وەڵامدانەوەی کۆمەڵێك پرسیار ئەنجام دەدرێت. هەوڵ دەدەین ئامانجی ئەم توێژینەوەیە لە چەند پرسیارێك کورت بکەینەوە.

1- پێناسە و چەمك و ناساندنی ڕێنووس لە زمانی کوردیدا؟



2- گرینگیی ڕێنووس لە قۆناغی بنەڕەتی و بازنەی یەکەم؟

3- ئایا ڕێنووس بنەمایە بۆ ناسینەوەی پیتەکان؟

4- ئایا هەڵسوکەوتی مامۆستا چەندە کاریگەرە بۆ تۆرانی قوتابی لە قوتابخانە و خوێندن؟

5- چی بکەین بۆ ئەوەی قوتابی خوێندنی خۆش بوێت؟

6- چۆن ببین بە مامۆستایەکی سەردەمی و پێشەنگ؟

7- باشترین شێواز بۆ گوتنەوەی ڕێنووس کامەیە؟

### ڕێبازی توێژینەوە

ڕێبازی ئەم توێژینەوەیە ڕێبازێکی وەصفییە، بە سوودوەرگرتن لەو سەرچاوانەی باس لە ڕێنووس و گرینگی و تایبەتمەندییەکانی دەکەن، هەروەها جۆرکانی چۆنیەتیی گوتنەوەی ڕێنووس خراونەتە ڕوو.

## بەشی دووەم

## کاریگەری ڕێگا و شێوازەکانی وانەگوتنەوە لە سەر مامۆستا و قوتابی، لە دیدی ڕۆشنبیرانی (٨) وڵاتدا

| | |
|---|---|
| گوستاف کارڵسون | سوید- ستۆکهۆڵم |
| زادە حەبیب | ئودرن- عەممان |
| شێخ موس دوندار | تورکیا – ماردین |
| ناز فەلەکەدین کاکەیی | ئێران- کەرەج |
| تیاگۆ سۆریس | بەرازیل- کوریتیبا |
| علیاء شەریف هاشمی | ئیماراتی عەرەبی- دوبەی |
| عبدالباست غفور | پاکستان- کەراجی |
| حەسەن ئامانج | یەکەمی هەرێمی کوردستان ٢٠٢٠ |
| شاندڵ موفق صبری | هەولێر عەنکاوە |
| لارا کامەران | کوردستان- کەرکوك- خوێندنی عەرەبی |
| هەژار سەلام | هەولێر -کۆیە |
| ئەحمەد فەخری | هەولێر-پیرمام |
| بێداد لەزگین عوبێد | هەولێر-سۆران |
| فوئاد جاسم مەلا برایم | هەولێر-مێرگەسۆر |
| هێمن عەبدولعەزیز | هەولێر-بارزان |

**گوستاف کارڵسون سوید- ستۆکهۆڵم**

گوستاف هاوڵاتییەکی سویدە، لە ستۆکهۆڵم دەژیت، بەم شێوەیە باس لە ئەزموونی ژیانی خۆی دەکات کاتێك لە بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتی قوتابی بووە.

زۆرم لە بیر نییە، بەڵام هەستێکی خۆشم هەبوو کاتێك بۆ یەکەم جار چووم بۆ قوتابخانە و لەگەڵ منداڵانی هاوتەمەنی خۆم دەستم بە یاری و خوێندن کرد.

لەگەڵ ئەوەی ئێمە دەنگە دەنگمان دەکرد و زۆر گوێمان لە مامۆستاکانمان نەدەگرت، بەڵام مامۆستاکان زۆر باش بوون، زۆر هێمن و لەسەرخۆ بوون، زۆر گرینگییان بە پەروەردە دەدا و بەردەوام شێوازی وانەوتنەوەیان دەگۆڕی، بە شێوەیەك لەگەڵ بیر و بیرکردنەوەی ئێمە بگونجێت بۆ ئەوەی وانەکە هەزم بکەین و ئارەزووی فێربوونمان زۆرتر بێت.

ئەوەی زۆر دڵخۆشی دەکردین بریتی بوو لە گرێدانی وانەکان بە ژیانی ڕۆژانەی ئێمە، بەتایبەت وانەکانیان بە فیلم کارتۆن و یاری گرێ دەدا، ئەمەش زۆر بەسوود بوو بۆ ئێمە.

ئەوەی وای لێ دەکردم ڕقم لە خوێندن بێت، قوتابی و هاوپۆلەکانم بوون، بەتایبەت ئەو قوتابییانەی لە ئێمە گەورەتر بوون توانجیان لێ دەداین، لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك مامۆستا وەڵامی پرسیارەکانی ئێمەی

نەدەدایەوە ڕاستەوخۆ ڕقم بەرامبەر قوتابخانە بۆ دروست دەبوو.

ئامۆژگاریم بۆ مامۆستا و دایك و باوكان ئەوەیە، كە بتوانن باش گوێ لە منداڵان و قوتابییان بگرن و بهێڵن لە كاتی گفتوگۆ قسەكانیان تەواو بكەن و مەبەستەكەیان بگەیەنن.

لە سوید تا پۆلی ٦ دەرنەچوون نییە، قوتابخانەكان زۆر كراوەن، لەگەڵ ئەوەشدا تا پۆلی ٩ بنەڕەتی خوێندن بەزۆرە و قوتابی نابێت واز لە خوێندن بهێنێت، بەهەر شێوەیەك بێت دەبێت پۆلی ٩ بنەڕەتی تەواو بكات، هەروەها قوتابی هەر كاتێك ئارەزوو بكات دەتوانێت بچێتەوە بۆ ماڵەوە.

مەرجی وازنەهێنان تا پۆلی ٩ بۆ ئەوە داندراوە، ئەگەر قوتابی تا پۆلی ٩ بنەڕەتی بخوێنێت ئیتر قوتابخانە و خوێندنی خۆش دەوێت و ناتوانێت واز لە خوێندن بهێنێت، چونكە سیستەمی پەروەردەی سوید ڕێز لە قوتابی و ئارەزووەكانی دەگرێت، لە قوتابخانەكان شتێك هەیە پێی دەڵێن باخچەی كات بەسەربردن، زۆربەی قوتابییەكان دوای قوتابخانە دەچن بۆ ئەم باخچەیە، لەم باخچەیە (ئەتاری، بلیارد، ...) شوێنی یاری هەیە، لەم باخچەیە منداڵ هەست بە ئارامی دەكات.

لە پۆلی یەك و دوو مامۆستاكان هەوڵ دەدەن ئارەزوی قوتابییەكان بزانن، ئایا قوتابی ئارەزووی چ جۆرە فیلم كارتۆنێك دەكات؟ زیاتر نموونە بەم شتانە دەهێننەوە كە قوتابی ئارەزووی لێیانە، ئەوەی زۆر گرینگە تا پۆلی ٩ بنەڕەتی هەموو شتێك مەیدانی و بەرجەستەیە بۆ قوتابی.

لەگەل ئەوەشدا دوای تەواوكردنی كۆلێژ كەس نابێت بە مامۆستا،



بەڵكو دەبێت دوای تەواوكردنی كۆلێژ مامۆستا كۆمەڵێك خولی تایبەت لە سەر بابەتەكەی خۆی ببینێت و هەموو زانیارییەكان بە پەروەردەیی بكرێن.

لە بازنەی یەكەمی قۆناغی بنەڕەتیدا بابەتەكانی پەیوەست بە ڕووداوەكانی ڕۆژانەیان فێر دەكردین، لەگەل ئەمەشدا ئەگەر كەسێك بیەوێت ببێت بە مامۆستای بازنەی یەكەمی قۆناغی بنەڕەتی، دەبێت نمرەی زۆر بەرز بەدەست بهێنێت، ئەگەر نا ناتوانێت ببێت بە مامۆستا لەم بازنەیەدا.

**زادە حەبیب ئوردن- عەممان**

زادە هاوڵاتییەکی ئوردنییە، لە عەممانی پایتەخت دەژیت، لە قۆناغی دووەمی بەشی تەکنەلۆجیا و زانیاری، لە زانکۆی حوسێن بن تەلال دەخوێنێت، یەکێکە لە گەنجە ناسراو و دیارەکانی عەممان، بەم شێوەیە باس لە ئەزموونی ژیانی خۆی دەکات کاتێك لە بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتی قوتابی بووە.

بە شێوەیەکی گشتی وەك هەر قوتابییەکی تر چوونە قوتابخانە و دەستکردن بە خوێندن بۆ من شتێکی نوێ بوو، ئەوەی جێگای سەرنج و تێرامان بوو نەماندەزانی چەندە کاتمان پێویستە بۆ خوێندن و پێویستە تا کەی بخوێنین، لەگەڵ ئەوەشدا نەماندەزانی چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ هاوپۆلەکانمان بکەین، چونکە لە خێزانی خۆمان نەبوون و شارەزاییمان لەگەڵیان نەبوو، ئەم ئەزموونە بۆ ئێمە زۆر ئاسان نەبوو، بەردەوام ترسی ئەوەمان هەبوو نەکا هەڵەیەکیان بەرامبەر بکەین، ئەمە شتێکی نامۆ و قورس بوو بۆ ئێمە، چونکە ئێمە تەنها منداڵێك بووین، لە سەرەتای ژیانمان بووین.

هەڵسوکەوتی مامۆستا لەم قۆناغە هەستیارە زۆر گرینگە، بە شێوەیەکی گشتی مامۆستاکانی من لە بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتی زۆر باش و بەڕێز بوون، بە جۆرێك هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکرین وەك ئەوەی لە ناو ناخ و دەروونی ئێمەدا ژیان بەسەر بەرن.

ئەو کەسەی بۆ خوێندن هانی دەدام دایکم بوو، دواتر قوتابییە



هاوپۆلەکانم زۆر باش بوون لەگەڵم، بەردەوام بووبوون بە هاندەر و پاڵپشت بۆ خوێندنم.

لەگەڵ ئەوەشدا مامۆستا هەبوو زۆر توند بوو، هەڵسوکەوتی زۆر خراپ بوو، وای دەزانی بەم شێوەیە باشتر لە وانەکان تێدەگەین.

داوا دەکەم مامۆستا لە بازنەی یەکەمی قوناغی بنەڕەتی لەگەل قوتابییەکانی زۆر نەرم و لەسەرەخۆ بێت، چونکە ئەم قۆناغە زۆر هەستیارە بۆ دروستبوونی کەسایەتیی مرۆڤ.

پێویستە خوێندن لە سەر بنەمای تێگەیشتن و بیرکردنەوە بێت، نەك ئەزبەرکردن، چونکە بیرکردنەوە مرۆڤ فێری ئاخاوتن و گفتوگۆکردن دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا لە کاتی وانەگوتنەوەدا بیرکردنەوەی کۆمەڵێك قوتابی ئەنجامی باشی دەبێت و قوتابییەکان دەبن بە هاوکار و یارمەتیدەری یەکتر و گیانی هاوکاری و کارکردن بە گروپ لە لایان دروست دەبێت.

**شێخ موس دوندار    تورکیا- ماردین**

شێخ موس قوتابیی دکتۆرایە لە بەشی پاراستنی ڕووەك لە زانکۆی چوکۆرۆڤا لە شاری ئەدەنەی تورکیا، بەم شێوەیە باس لە ئەزموونی خۆی دەکات کاتێك لە بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتی قوتابی بووە.

کاتێك چووم بۆ قوتابخانە زۆر بە دڵخۆشیەوە پێشوازییان لێدەکردین، تەنیا زمانی کوردیم دەزانی، زمانی کوردیش زمانی دایکم بوو.

بە شێوەیەکی گشتی مامۆستاکان زۆر لێیان دەداین و زۆر کاریگەرییان لە سەرمان نەبوو، ئەم پێشوازییە گەرمەی لە سەرەتای چوونمان بۆ قوتابخانە لێیان دەکردین زۆر گۆڕا و هەڵسوکەوتیان لەگەڵمان زۆر پێچەوانە بووەوە.

ئەو ڕێگایانەی مامۆستا بۆ وانەگوتنەوە و فێربوون بەکاریان دەهێنا زۆر کلاسیك و کۆن بوون، هەموو بابەتەکان بۆ دەرخ و ئەزبەرکردن (لەبەر کردن) بوو، بە شێوەیەکی گشتی هەوڵی ئەوەیان نەدەدا هانی قوتابی بدەن بۆ بیرکردنەوە و تەرکیزکردن.

ئامۆژگاریم بۆ مامۆستا ئەوەیە هەوڵ بدەن وەك هاوڕێ و کەسوکاری قوتابی بن و لێیان نزیك ببنەوە، سەرەتا هەوڵی ناسینی قوتابی و بارودۆخی قوتابی بدەن، ئینجا بڕیار لە سەر پاداشت و سزا بدەن، چونکە هەندێك قوتابی لە بارودۆخێکی تایبەتی خێزانیدا دەژین و پێویستە بە پێی پێویست ڕەچاوی ئەم بارودۆخە بکرێت.



**ناز فەلەکەدین کاکەیی    ئێران- کەرەج**

ناز بەڕێوەبەری کتێبخانەی زەیتونە، یەکێکە لە نووسەر و چالاکە ناسراوەکانی هەرێمی کوردستان، بەم شێوەیە باس لە ئەزموونی خۆی دەکات کاتێك لە بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتی قوتابی بووە.

٥ ساڵان بووم کاتێك چووم بۆ قوتابخانە، قوتابخانەکەم لە کەرەجی ئێران بوو، ئەوەندە بچووك بووم، لە سەر تەختەیەك ڕادەوەستام، تا دەستم بگاتە تەختە ڕەش بۆ نووسین.

ئەوەی منی هان دەدا بۆ قوتابخانە خوشکە گەورەکەم و باوکم بوون، چونکە بەردەوام خەریکی خوێندنەوە بوون، کتێبی زۆرمان لە ماڵەوە هەبوو، باوکم بەردەوام چیرۆکی منداڵانی بۆ دەخوێندمەوە، دایکیشم مەتەڵ و بەسەرهاتی بۆ دەگێڕامەوە.

ئارەزووی ئەوەم دەکرد زوو فێری نووسین و خوێندنەوە ببم، چونکە باوکم بەردەوام لە سەفەر و پێشمەرگایەتی بوو، هەندێك جار بە ساڵ باوکم نەدەبینی، ئارەزووم دەکرد نامەی بۆ بنێرم، هەر لەبەر ئەوە بوو ئارەزووم دەکرد زوو فێری نووسین و خوێندنەوە ببم.

بە شێوەیەکی گشتی هەڵسوکەوتی مامۆستاکان زۆر باش بوو، مامۆستاکان کاتی زۆریان بۆ ئێمە تەرخان دەکرد، خۆم زۆر سەرسام بووم بە جل و بەرگ و مکیاجی مامۆستایەك کە خەڵکی مهاباد بوو و نازناوی توتنچی هەبوو، جانتا و قەڵەمەکانم زۆر خۆش دەویست، جانتاکەم ڕەنگی

شەکەری بوو، ڕەسمی فیلێکی کارتۆنی لە سەر بوو، قەڵەمەکەم بووکە شوشەیەکی پێوە بوو، زۆر ئارەزووی شیعرم دەکرد، لە لاپەڕەی کۆتایی کتێبی فارسی پۆلی یەك شیعرێکی تێدا بوو.

بەبیرم دێت پۆلی سێی بنەڕەتی بووم، یەکێك لە مامۆستاکانم نقۆرچەی لە ڕومەتم دا لەبەر ئەوەی وشەیەکم بەهەڵە نووسی.

هەروەها جارێك یەکێك لە مامۆستاکانم زلەیەکی لێدام، بەڵام هەستم بە پەشیمانبوونەوەی مامۆستا کرد، چونکە من قوتابییەکی زیرەك بووم.

ئامۆژگاریم بۆ مامۆستایان ئەوەیە کە ببن بە هاوڕێی قوتابی، چونکە زۆربەی دایك و باوکان ناتوانن وەك پێویست خۆشەویستی بە منداڵەکانیان ببەخشن، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ژینگەی کۆمەڵایەتیی خێزان.

داوا دەکەم مامۆستایان زیاتر بایەخ بە پەروەردە و خۆشەویستی بدەن، مامۆستای سەردەم دەبێت ڕاشکاو بێت و فرمێسکەکانی قوتابی بە دەستەکانی خۆی بسڕێت، هەست بە ناخۆشی و خۆشییەکانی قوتابی بکات، دەبێت هەموو چرکەکانی ژیانی بۆ فێرکردن و پەروەردەکردنی قوتابییەکانی تەرخان بکات و ببێتە جێگای متمانە و ئومێدی ئایندەی قوتابییان.

سوپاسی مامۆستاکانم دەکەم، کە زۆر بە پەرۆشەوە خەریکی پەروەردەکردنم بوون، بەردەوام هانیان دەدام بۆ ئەوەی ببمە مرۆڤێکی بەسوود بۆ کۆمەڵگە.



**تیاگۆ سۆریس بەڕازیل- کوریتیبا**

تیاگۆ ئێستا لە سوید دەژیت، پشتگیریی ڕێکخراوە ناحکومیەکان دەکات و بڕوانامەی ماستەری لە ئاشتی و گەشەپێدانی کار هەیە، بەم شێوەیە باس لە ئەزموونی خۆی دەکات کاتێك لە بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتی قوتابی بووە.

سەرەڕای جیاوازیی کلتوور و پەروەردە تێبینیی ئەوەم دەکرد کە هەڵسوکەوتی مامۆستاکان جیاوازە، ئەوەی پەیوەندی نێوان قوتابی و مامۆستا بەهێز دەکات بریتییە لە باوەڕ و متمانەی مامۆستا، لەبەر ئەوە باشترین مامۆستا ئەوانەن کە پەیوەندییەکی دۆستانە لەگەڵ قوتابی دروست دەکەن، قوتابی ئەم مامۆستایانەی هەمیشە لەبیرە و دڵسۆزی و خۆشەویستیی تایبەتی بۆیان هەیە، چونکە ئەم جۆرە مامۆستا دلسۆزانە زۆر کەمن و هەموو هەوڵێکیان دەخەنە گەر بۆ پێگەیاندنی قوتابی.

باشترین ڕەفتار بۆ مامۆستا ئەوەیە کە دادپەروەر بێت و ڕێز لە خۆی و قوتابییەکانی بگرێت، جیاوازیی ڕەگەز و ئایین نەکات بە پێوەری سەرکەوتنی قوتابییەکان.

لە کۆتاییدا من دەڵێم پەروەردە یەکڕیزی و ئاشتییە، کەواتە دەبێت مامۆستا لە ڕێگای قوتابخانە و خوێندن هەوڵی ئاشتی و یەکڕیزی بدات.

**علیاء شەریف هاشمی — ئیماراتی عەرەبی- دوبەی**

علیاء وتەبێژی فەرمیی ڕێکخراوی ویژدانییە بۆ مافەکانی مرۆڤ، خاوەنی دکتۆرای فەخری و مەدالیای سەرکردایەتی و داهێنانە لە بواری مرۆڤایەتیدا، وەك باڵیۆزی مرۆڤایەتی لە کۆنگرەی سەرکردەکانی عەرەب بەشدار بووە.

سەرەتای چوونم بۆ قوتابخانە زۆر دڵخۆش بووم، چونکە لەگەڵ ئامۆزاکەم چووین بۆ قوتابخانە، ئەو لە تەمەنی خۆم بوو، سەرەتا مامۆستا منی بە قوتابییەکانی تر ناساند و شوێنی دانیشتنی پیشاندام.

مامۆستاکەم خانمێکی هێمن و لەسەرەخۆ بوو، لە مامەڵەکردن سەبرێکی زۆری هەبوو و زۆر بەسۆز بوو، ئەوەی زۆر هانی دەدام قوتابخانەم بەدڵ بێت خێزانەکەم و مامۆستاکان بوون.

ئامۆژگاریم بۆ مامۆستایان ئەوەیە، کارامەیی و ڕاوێژ بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی قوتابییان بەکار بهێنن.

مامۆستاکان چەندین ڕێگای جیاوازی وانەگوتنەوەیان بەکار دەهێنا وەك: پێشکەشکردن، ڕۆڵ بینین، تاقیکردنەوەی هەفتانە، ئەمانەش بۆ دڵنیابوون بوو لە ستانداردی خوێندن و دانەبەزینی ئاستی قوتابی.



**عەبدولباست غەفور — پاکستان- کەراجی**

بەبیرم دێت هەموومان گریاین کاتێك مامۆستا پێی گوتین ئەگەر پەرە بە تواناکانی خۆتان نەدەن و هەوڵ بۆ خوێندن نەدەن دەتوانین سزاتان بدەین، یان کاتی پشووەکانتان لێ دەخۆین و دەرگای ژوورەکەتان لێ دادەخەین تا نەتوانن بچنە دەرەوە.

بە شێوەیەکی گشتی هەڵسوکەوتی مامۆستاکان زۆر باش بوو لەگەڵ ئەو قوتابییانەی کە زیرەك بوون، بەڵام زۆر توند و بێبەزەیی بوون لەگەڵ ئەو قوتابییانەی کە کێشەی خوێندنەوە و نووسینیان هەبوو.

لەڕاستیدا من هەرگیز نەمدەویست بخوێنم و بچم بۆ قوتابخانە، بەڵام ڕۆژێك کۆمەڵێك وێنەم کێشا، مامۆستا وێنەکانی زۆر بەدڵ بوو پێی گوتم وێنەکان زۆر جوانن، ئەگەر هەوڵ بدەیت دەتوانیت سەرکەوتوو بیت، لەو کاتە هەستم کرد خوێندن و قوتابخانە دەتوانن بەهرەکانم دەربخەن.

کاتێك لە قوتابخانە بووم ڕۆژێك یەکێك لە مامۆستاکان زلەیەکی زۆر توندی لە دەموچاوی یەکێك لە قوتابییەکان دا، ئەمەش وای کرد ڕقم لە خوێندن بێت.

ئامۆژگاریم بۆ مامۆستایان ئەوەیە کە بزانن مامۆستایەتی پیشەیەکی پرۆفیشناڵە و دەبێت مامۆستا بە هەستێکی خۆشەوە ئەم ئیشە بکات.

پێویستە مامۆستا باشترین ڕێگای وانەگوتنەوە بەکار بهێنێت، هەروەها دەبێت بابەتەکان بە ڕووداوەکانی ڕۆژانە ببەستێتەوە بۆ ئەوەی چێژ لای قوتابی دروست بکات.

**حەسەن ئامانج        هەولێر- یەکەمی هەرێمی کوردستان ٢٠٢٠**

حەسەن یەکەمی هەرێمی کوردستانە بۆ ساڵی ٢٠٢٠، ئێستا قوتابییە لە زانکۆی هەولێری پزیشکی- بەشی پزیشکیی گشتی، بەم شێوەیە باس لە ئەزموونی خۆی دەکات کاتێك لە بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتی قوتابی بووە.

پێویستە هەموومان پەنجەی چارەسەر بخەینە سەر برین و ئازارەکانی قوتابییان لە بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتی، هەروەها باسی ئەو گرفتانە بکەین کە لەم قۆناغەدا ڕووبەڕووی قوتابییان دەبنەوە.

بە باشی دەزانم چاوێك بە یادەوەرییەکانی سەرەتاکانی چوونم بۆ قوتابخانە بخشێنمەوە، کاتێك چووم بۆ قوتابخانە بە هەنگاوە بچووکەکانم هەوڵی بنیاتنانی داهاتووم دەدا، هیوام دەخواست ئەو ئامانجانەی کە لە بیرم پەروەردەم کردوون بەدییان بهێنم.

سەرتای چوونە قوتابخانە هەستێکی پڕ لە وزە و سەیرم هەبوو، ترسی ئەوەم هەبوو ئەو ئاسوودەییەی لە ماڵەوە هەم بوو لە قوتابخانە دەستم نەکەوێت، یان مامۆستا وەك پێویست لە ئەرکەکانم یارمەتیدەرم نەبێت، هەمیشە پرسیارم دەکرد ئایا دەبێت مامۆستا منی خوش بوێت؟ بەم شێوەیە بەرەو ماڵی دووەمم بەڕێکەوتم.

بە شێوەیەکی گشتی هەڵسوکەوتی مامۆستاکان باش بوو، بەڵام لەبەر زۆریی ژمارەی قوتابییان نەیاندەتوانی وەك پێویست نازی ئێمە



هەڵبگرن و گرینگیمان پێ بدەن.

پێویستە مامۆستا بە زەردەخەنەوە لەگەڵ قوتابی هەڵسوکەوت بکات، چونکە یەکەم دیدار چۆن بێت ئەم وێنەیە لە زەینی قوتابی دەچەسپێت، دەبێت مامۆستا نموونەیەکی جوان پیشان بدات، تا وێنەیەکی جوانی لە زەینی قوتابی بچەسپێت.

من گلەیی لە مامۆستا ناکەم ئەگەر نەیانتوانیبێت وەك پێویست مامەڵەمان لەگەڵ بکەن و ڕێزمان بگرن، سەرەڕای نەبوونی نازی پێویستی مامۆستاکان، لەم قۆناغەدا هاوڕێی باش و بەوەفامان دەست کەوت و توانیمان ببین بە هاوکار و یارمەتیدەری یەکتر، ئەوەی قوتابخانەی لا خۆشەویست کردبووین هاوڕێکان و مامۆستا قەدرگرانەکان بوون، هەموو هەوڵێکی خۆیان دەدا بۆ ئەوەی هەرچی وزە و توانایان هەیە بە ئێمەی ببەخشن و فێرمان بکەن، بەردەوام بە پاداشتی مەعنەوەی هانیان دەداین بۆ ئەوەی زیاتر بخوێنین.

ئەوەی ئێمەی تووشی دڵەڕاوکێ و بێتاقەتی دەکرد بریتی بوو لە گرینگیدانی زیاتر بەو قوتابییانەی کە زووتر فێردەبوون، مامۆستاکان زیاتر بەسەر ئەواندا هەڵیاندەگوت، ئەم جۆرە هەڵسوکەوتەی بەشێك لە مامۆستاکان دەبووە هۆکاری ڕووخان و باوەڕ بەخۆ نەبوون لای قوتابی، لەگەڵ ئەوەشدا هەستی متمانە بەخۆبوون کەم دەبووەوە.

کاتێك قوتابییەك باسی لە بیرۆکەیەك دەکرد مامۆستا بەشێوەیەك وەڵامی دەدایەوە کە ئەم بیرۆکەیە زۆر گەورەترە لە توانای ئەم قوتابییە، بەم شێوەیەش قوتابی هەستی خۆ بەکەم زانینی لا دروست دەبوو و کاریگەریی

نەرێنیی دەکردە سەر دەروونی قوتابی، بە شێوەیەك نەتوانێت جارێکی تر باسی بیرۆکە و خەونەکانی بکات.

بە شێوەیەکی گشتی مامۆستا لە بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتیدا ئەرکی قورسترە لە قۆناغەکانی تر، چونکە لەم قۆناغە بناغەی هیوا و زانست و بیرکردنەوە دروست دەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا قوتابی جۆرە ترسێکی لە دڵدایە، چونکە قوتابی تێکەڵی ژینگەیەکی نوێ دەبێت کە زۆربەی شتەکانی دەوروبەری جیاوازن، پێویستە مامۆستا وریایانە مامەڵە لەگەڵ قوتابی بکات، بۆ ئەوەی ئەو ترسەی لە دڵیدا هەیە نەیهێڵێت.

داوا لە مامۆستایان دەکەم، بە پەرۆشەوە هەوڵی پەروەردەکردنی قوتابی بدەن، ئەوەی زۆر گرینگە پێویستە هەستی متمانەبەخۆبوون لە دڵێ قوتابییان دروست بکەن، چونکە هەبوونی متمانە هەبوونی هێز و توانایە، قوتابی چەندە توانای هەبێت، بەڵام متمانەی بەخۆی نەبێت ناتوانێت پێشکەوێت و بەهێز بێت.



**شاندڵ موفق صبری هەولێر- عەنکاوە**

شاندڵ ئەندازیاری نەوتە، بەم شێوەیە باس لە ئەزموونی ژیانی خۆی دەکات کاتێك لە بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتیدا قوتابی بووە.

چوون بۆ قوتابخانە زۆر دڵخۆشی کردم، چونکە هەموو هاورێکانم لەوێ بوون، قوتابخانە بۆ من و هاوڕێکانم ئەزموونێکی تازە بوو.

هەڵسوکەوتی مامۆستاکان زۆر باش بوو، بەتایبەتی لە بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتی کە دەکاتە پۆلی ١ و ٢ و ٣ ی بنەڕەتی، لەم قۆناغە زۆر هاوکاریی ئێمەیان دەکرد، چونکە زۆر بچووك بووین، بەردەوام هەوڵیان دەدا ئێمە دڵخۆش بین.

بەردەوام هەولی خوێندنم دەدا بۆ ئەوەی نمرەی بەرز بەدەست بهێنم، چونکە دایك و باوکم دڵیان زۆر خۆش دەبوو بە نمرە بەرزەکانم، هەموو کات هانیان دەدام بۆ ئەوەی بخوێنم و نمرەی بەرز بەدەست بهێنم، سەرەتای خوێندنم تەنها بۆ نمرە بوو، بەڵام دواتر بیرم کردەوە کە دەبێت بۆ فێربوون بخوێنم، واتە لەگەڵ بەدەستهێنانی نمرەی بەرز هەوڵی فێربوون بدەم.

ئەوەی بەردەوام لە مامۆستاکان گوێبیستی دەبووم بریتی بوو لە گوتنەوەی ئەو ڕستەیەی (ئەگەر فێر بن، یان فێر نەبن من مووچەی خۆم هەر وەردەگرم)، ئەم ڕستەیە زۆر بێزاری دەرکردم و خاوی دەکردمەوە لە خوێندن، چونکە وام هەست دەکرد، کە خوێندن گرینگییەکی ئەوتۆی

نییە، بۆیە مامۆستا بەردەوام ئەم ڕستەیە دووبارە دەکاتەوە.

بڵاوکردنەوەی ترس و دڵەڕاوکێ یەکێکی تر بوو لەو ڕەفتارانەی زۆر پەست و بێزاری دەکردم، بە جۆرێك مامۆستا وایان پیشانی ئێمە دابوو کە هەموو ژیانمان لە سەر نمرەی تاقیکردنەوەکانمانە.

شێوازی وانەگوتنەوە بە پێی مامۆستا دەگۆڕا، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی لە وانەی بیرکاری مامۆستاکان نەیاندەتوانی ڕێگایەکی دروست و گونجاو بدۆزنەوە و بەکاری بهێنن بۆ ئەوەی قوتابی سوود لە وانەکە وەربگرێت.

لە کۆتاییدا داوا لە مامۆستا خراپەکان دەکەم، بۆ جارێکیش بێت خۆیان لە شوێنی قوتابی دابنێن و بزانن هەڵسوکەوتیان چۆنە، ئەگەر بەم شێوە خراپ و نەشیاوەی ئەوان هەڵسوکەوت دەکەن، بەهەمان شێوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکرێت بەرگە دەگرن، پێویستە مامۆستا ببێتە پردێکی پەیوەندی بەهێز لە نێوان خۆیان و قوتابی و خانەوادەی قوتابی، بۆ ئەوەی بە هەموویان بتوانن بە باشترین شێواز خزمەتی قوتابییان بکەن و نەوەیەکی هۆشیار و تەندروست بۆ کۆمەڵگە و دواڕۆژ دروست بکەن.



**لارا کامەران کوردستان- کەرکوك- خوێندنی عەرەبی**

لارا مامۆستایە لە باخچەی ساوایان، قۆناغی بنەڕەتی لە یەکێك لە قوتابخانەکانی شاری کەرکوك بە زمانی عەرەبی تەواو کردووە، بەم شێوەیە باس لە ئەزموونی ژیانی خۆی دەکات کاتێك لە بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتی قوتابی بووە.

سەرەتای چوونم بۆ قوتابخانە دڵی زۆر خۆشکردم، زۆر بە پەرۆش و تامەزرۆییەوە دەچووم بۆ قوتابخانە.

هەڵسوکەوتی مامۆستاکان تا ڕادەیەك باش بوو، بەتایبەت مامۆستا مەسیحیەکان باشتر بوون، من لە خێزانێك گەورە بووم کە زۆر ئارەزووی خوێندنمان دەکرد، ئەمەش یەکێك بوو لەو هۆکارانەی کە وای لێکردبووم ئارەزووی خوێندن بکەم.

پێش ئەوەی بچم بۆ قوتابخانە زۆر شتم ئەزانی دەربارەی ئەلف و بێی کوردی و بابەتەکان لام ئاشنا بوون، ئەمەش زیاتر هانی دام بۆ خوێندن و وای دەکرد قوتابخانە و خوێندنم خۆش بوێت.

بە شێوەیەکی گشتی هەندێك ڕەفتاری مامۆستا وای دەکرد لە قوتابخانە و خوێندن بترسم و ڕقم لێی بێت، یەکێك لەو ڕەفتارانە بریتی بوو لە ژاوەژاو و دەنگی زۆری قوتابییان و کۆنتڕۆڵ نەکردنی پۆل لەلایەن مامۆستا، زۆر جار لەبەر ئەم هۆکارە مامۆستا لە هەموو قوتابیەکانی دەدا و بەشێك لەو قوتابییانەی کە بێ کێشە و زیرەکیش بوون لەلایەن مامۆستا

بەر ئەو هێرشە دەکەوتن و لێدانیان بەردەکەوت، لەم کاتە هەستێکی زۆر ناخۆشم هەبوو.

ئامۆژگاریم بۆ مامۆستایان ئەوەیە لە پۆلی یەکی بنەڕەتی (سەرەتایی) تا دەتوانن نەرم و نیان بن لەگەڵ قوتابییان و هەوڵ بدەن کۆنترۆڵی پۆل بکەن، ئەرکی ماڵەوەیان بە دروستی پێ بدەن و زیاد لە پێویست بابەتیان بەسەر بەجێ نەهێڵن کە نەتوانن کۆنترۆڵی بکەن.

بە شێوەیەکی گشتی لەو سەردەمەی من قوتابی بووم لە پۆلی (یەك، دوو، سێ)، وانەگوتنەوە زۆر کلاسیك بوو و شتێکی تازە و بەرجەستە بوونی نەبوو، تەنها خوێندنەوە و ڕێنووس و ئەرکی ماڵەوە بەشێك بوو لە خوێندنی ڕۆژانە.



**هەژار سەلام          هەولێر کۆیە**

هەژار قوتابییە لە قۆناغی چواری زانکۆی هەولێری پزیشکی، بەشی پزیشکیی گشتی، لەگەڵ ئەوەشدا یەکێکە لە یوتیوبەرە بەناوبانگەکانی هەرێمی کوردستان، بەم شێوەیە باس لە ئەزموونی خۆی دەکات کاتێك لە بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتی قوتابی بووە.

کاتێك منیان بۆ قوتابخانە برد و بووم بە قوتابی، زۆر دڵخۆش بووم، هەستێکی زۆر تایبەتم هەبوو، سەرەتا مامۆستاکانم وەك شارەزا و پسپۆڕ دەبینی، بەڵام هەندێك لە مامۆستاکان تایبەتتر بوون لەوانی تر، هەندێك هۆکار هەبوون وای کردبوو زیاتر چێژ لە وانەکانی هەندێك مامۆستا ببینم، بەڵام هەمان چێژ لە وانەی ئەوانی تر نەبینم.

ئەو هۆکارانەی وایان کردبوو چێژ لە هەندێك وانە ببینم.

١- هەندێك مامۆستا ناوی هەموو قوتابییەکانی لەبیر بوو، گرینگیی بە هەمووان دەدا، ئەگەر گرینگیی زیاتری بە هەر یەکێك لە ئێمەی قوتابی بدابوایە، لەبەر ئەوە گرینگیی زیاتری پێ دەدا، کە زیرەکتر، ئاقڵتر بوو، نەك لەبەر هۆکاری لاوەکی و خزمایەتی، ئەم هەڵسوکەوتە هۆکارێکی گرینگ و پاڵنەرێکی بەهێز بوو بۆ ئەوەی هەندێك مامۆستام زیاتر خۆش بوێت و زیاتریش گرینگی بە وانەکانیان بدەم.

بیرم دێت، لە پۆلی یەکەمی بنەڕەتی، نەخۆش کەوتم و ماوەی یەك هەفتە نەچوومەوە بۆ قوتابخانە، لەو کاتەی من نەخۆش بووم، وانەی

مێوژیان خوێندبوو، مامۆستا مێوژی بۆ قوتابییان هێنابووە پۆل بۆ ئەوەی وانەکەی لە سەر بخوێنن، دوای ئەو هەفتەیەی کە من گەڕامەوە بۆ قوتابخانە، منیان لەبیر نەکردبوو و مێوژیان بۆ من هەڵگرتبوو، ئەمەش وای کرد هەستی گرینگیپێدان بزانم و تا ماوم گرینگی بەو هەستە بدەم و لە ژیانم دووبارەی بکەمەوە.

٢- هەندێك مامۆستام زیاتر خۆش دەویست، بەتایبەت کاتێك یەکێك لە هاوپۆلەکانم هەڵەی دەکرد، مامۆستا توڕە نەدەبوو و بەسەر خۆی نەدەشکاندەوە، بەڵکو هەوڵی زیاتری لەگەڵ دەدا و فێری دەکرد، بەڵام کاتێك مامۆستا قوتابییەکی بەسەر خۆی دەشکاندەوە لەبەر ئەوەی لە وانەکە تێنەگەیشتووە، زۆر دڵتەنگ دەبووم و بگرە بەدرێژایی ڕۆژگار ئەم هەڵسوکەوتەی مامۆستا بێتاقەتی دەکردم؛ چونکە دەمبینی کە قوتابییەکە چۆن تەریق بووەتەوە و قوتابییەکانی تر گاڵتەی پێ دەکەن.

٣- ئەو مامۆستایانەی لە کاتی وانەگوتنەوەدا شتی بەرجەستە و پەیوەست بە وانەکەیان بۆ دەهێناین و پێیان پیشان دەداین وەك: شەش پاڵو لە وانەی بیرکاری، سێو لەوانەی کوردی، لام خۆشەویستتر بوون و زیاتر هەوڵی خوێندنم دەدا لە وانەکانیان، هەروەها وانەکانیان زیاتر لە مێشك و هزرمان دەمایەوە و بە تەواوی فێر دەبووین.

لەگەڵ ئەمانەشدا هەندێك هۆکار وای دەکرد ئارەزووی خوێندنم نەبێت و قوتابخانە و هەندێك وانەم خۆش نەوێت، لەگەڵ ئەوەشدا ڕقم لە هەندێك مامۆستا ببێتەوە، وەك:



١- بەراوردکردنی قوتابی لەگەڵ یەکتر، مامۆستا بەردەوام قوتابییەکانی بە یەکتر بەراورد دەکرد و ڕەچاوی جیاوازیی تاکایەتیی نەدەکرد، بۆ نموونە، فڵان قوتابی زیرەکە، تۆ بۆ زیرەك نییت، تۆ هیچ نازانیت، ئەمانە هۆکاری نەرێنی بوون و هەرگیز لە بیرم ناچنەوە، بەردەوام مامۆستا بەرامبەر هەندێك قوتابی دووبارەی دەکردەوە، کاتێك گوێم لەم وشانە دەبوو زۆر بێهێز و بێتاقەت دەبووم.

٢- دەبوایە زۆر خێرا وەڵامی پرسیاری مامۆستا بدەیتەوە، خۆ ئەگەر زۆر خێرا وەڵامت نەدابوایەوە، مامۆستا ئەو قوتابییەی پشتگوێ دەخست و چاوەڕوانی نەدەکرد بۆ ئەوەی بیر بکاتەوە، هەمان پرسیاری ئاڕاستەی قوتابییەکی تر دەکرد، چونکە پرسیار هەبوو پێویستی بە بیرکردنەوە هەبوو، نەك ئەوەی بە یەك چرکە و بێ بیکردنەوە وەڵام بدرێتەوە، هەر لەبەر ئەم ڕەفتارەی مامۆستا کە بواری بیرکردنەوەی نەدەدا، تا ئێستاش لە ئەنجامی ٦ × ٧ و ٨ ×٧ ی بیرکاری دڵنیا نیم، چونکە هیچ کات بواری بە بیرکردنەوە نەدەدا و دەبوایە بە یەك چرکە و ڕاستەوخۆ وەڵام بدەینەوە.

٣- توڕەیی بەردەوامی مامۆستا بووبووە فۆبیایەکی بەردەوام لە سەر هەست و بیرکردنەوەم، ئەم توڕەبوونە بەردەوامەی مامۆستا وای لێکردبووم ئەگەر دڵنیا بوومایە وەڵامەکەم ڕاستە دەستم هەڵنەدەبڕی لە ترسی توڕەیی مامۆستا.

٤- لێدان.

**ئەحمەد فەخری هەولێر - پیرمام**

ئەحمەد دامەزرێنەر و خاوەنی فێرکادیمییە، یەکێکە لە گەنجە خۆبەخشەکانی شاری هەولێر، چەندین ساڵە وەك خۆبەخش لە بواری پەرەپێدان بە تواناکانی گەنجان کار دەکات، بەم شێوەیە باس لە ئەزموونی ژیانی خۆی دەکات کاتێك لە بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتی قوتابی بووە.

کاتێك دەستم بە خوێندن کرد و چوومە قوتابخانە، تازە جەنگ کۆتایی هاتبوو، سەرەتای دەستکردن بەخوێندن و قوتابخانە بۆ من کەمێك گران بوو، نامەوێ باسی ڕووداوە ناخۆشەکانی ئەم قۆناغەتان بۆ بکەم، بەڵکو باس لە ساتە خۆشەکان دەکەم.

کاتێك چاوم بە پەرتووك و مامۆستاکان کەوت، هەستێکی خۆشم لا دروست بوو، هەرچەندە ئەوکات پەرتووکەکان نوێ نەبوون و زۆربەیان دڕاو و کۆن بوون، بەڵام هەر دڵخۆشکەر بوون، هەموو شتێك دڵی خۆشدەکردم، بەتایبەت ئەو خۆراکانەی کە لە قوتابخانە دابەش دەکران خۆشییەکی تایبەتییان پێدەدام.

بە شێوەیەکی گشتی شێوازی خوێندن و ئەو ڕێگایانەی کە مامۆستا بۆ گوتنەوەی وانەکان بەکاریان دەهێنا زۆر گونجاو نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەڵسوکەوتی هەندێك مامۆستا گونجاو نەبوو لەگەڵ ئێمەدا.

مامۆستاکان نەبووبوون بە هاوڕێی ئێمە، بیرم دێت ڕۆژێك چووم بۆ قوتابخانە هاوڕێکەم نەهاتبوو؛ چونکە نەخۆش بوو، بۆیە منیش خۆم



نەخۆش خست تا بچمەوە ماڵەوە؛ لەبەر ئەوەی تەنها ئەو هاوڕێم بوو، بەڵام ئەگەر مامۆستاکان هاوڕێیەتیی منیان بکردایە ڕەنگە خۆم نەخۆش نەخستبا بۆ چوونەوە، کەواتە ئەمە هۆکار بوو بۆ ئەوەی ئارەزوی ڕاکردنمان زیاتر بێت لە ئارەزووی مانەوە لە قوتابخانە.

لەگەڵ ئەمانەشدا زۆر شتی باش فێر بووین و ئەم سێ ساڵەی قۆناغی بنەڕەتی بۆ ئێمە بووە قوتابخانەیەکی گەورە و لەوێ دەستمان بە ژیان کرد.

داواکارم مامۆستا لەگەڵ قوتابییەکانی ببێت بە هاوڕێ، چونکە گیانی هاوڕێیەتی هۆکارە بۆ ئەوەی قوتابی وانە و قوتابخانە و مامۆستاکانی خۆش بوێت.

قوتابخانە ماڵی دووەمی قوتابییە، ئەگەر کەشێکی ئارام بۆ قوتابی نەڕەخسێندرێت، قوتابی ناتوانێت بەردەوام بێت، بگرە ئەگەر بە زۆریش لە قوتابخانە بمێنێتەوە سوودێکی ئەوتۆ لە وانەکان و ئامۆژگاریی مامۆستاکانی وەرناگرێت، بۆیە پێویستە مامۆستا لە مامەڵەکردن لەگەڵ قوتابییەکانیدا زۆر ورد بێت، چونکە هەر هەڵسوکەوتێکی نەشیاو و توند دەبێتە هۆی ئەوەی کاریگەریی نەرێنی لە سەر کەسایەتیی قوتابی جێبهێڵێت.

**بێداد لەزگین عوبێد** **هەولێر- سۆران**

بێداد قوتابییە لە قۆناغی دووەمی بەشی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی زانکۆی سۆران، یەکێکە لە ئەندامە کاراکانی دەنگی نیشتمانی جیهانی گەنجان، بەم شێوەیە باس لە ئەزموونی ژیانی خۆی دەکات کاتێك لە بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتی قوتابی بووە.

قوتابخانە دامەزراوەیەکی فەرمیی پەروەردەیی و کۆمەڵایەتییە، ڕۆڵ و ئەرك و بەرپرسیاریەتیی زۆری تێدایە، هەرە گرینگترینیان بریتییە لە ڕۆڵی پەروەردە و فێرکردن، لەگەڵ ئەمەشدا ناوەندێکە بۆ ڕۆشنبیربوون و پێگەیاندنی تاك، ئەمەش هۆکارە بۆ ڕەخساندنی ژینگەیەکی لەبار بۆ بیرکردنەوە و بەهێزکردنی هزر و بیری قوتابییان.

قوتابخانە ماڵی دووەمی قوتابییە، لەگەڵ چوون بۆ قوتابخانە قۆناغێکی گرینگ لە ژیانی مرۆڤ دەست پێدەکات، ئەم قۆناغە دەبێتە یادگارییەکی جوان و پڕشنگدار کە هەرگیز لەبیر ناکرێت.

قوتابخانە جگە لە سوودگەیاندنی بە قوتابی هیچ زیانێکی بۆ قوتابی و کۆمەڵگە نییە و ڕۆڵی سەرەکی لە گەشەپێدان و پەرەپێدانی تواناکانی تاك دەگێڕێت.

یەکەمین ڕۆژی چوونم بۆ قوتابخانە بە گرینگترین و خۆشترین ڕووداوی ژیانم دەزانم، لەگەڵ دەستکردن بە خوێندن زۆر گورج و گۆڵ دەستم پێکرد، زۆر چالاك بووم و بەشداریی چالاکییەکانی قوتابخانەم دەکرد، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ خۆشەویستیم بۆ قوتابخانە زیاتر دەبوو، پاڵنەری زۆرم بۆ دروست بوو، تا پەرە بە تواناکانی خۆم بدەم و بەردەوام بم لە خوێندن.



مامۆستاکانم جوانترین و پاکترین ئەکتەری ژیانم بوون، هەموویان زۆر دڵسۆز و باش بوون، وەك ئەندامێکی خێزانی خۆمان وابوون، بەردەوام لە خەمی ئێمەدا بوون، هەموو توانای خۆیان خستبووە کار بۆ ئەوەی ببین بە نەوەیەکی تێگەیشتوو و پێگەیشتوو بۆ وڵات، زۆر دڵسۆزانە ئەرك و بەرپرسیاریەتیی خۆیان بەجێ دەگەیاند.

ئامۆژگارییە بەردەوامەکانی مامۆستاکانمان ئێمەیان گەیاندە کەناری ئارامی و خۆشبەختی، بیرم نایەت ڕۆژێك ڕقم لە قوتابخانە و خوێندن بووبێتەوە، بەردەوام شەونخونیم دەکرد؛ بۆ ئەوەی مامۆستاکانم دڵیان لێم نەڕەنجێت، ئەوەی ئێستا من پێی گەیشتووم ئەنجامی هەوڵ و ماندووبوونی مامۆستاکانمە لە بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتی، چونکە ئەو قۆناغە بۆ من بووە بناغەیەکی پتەو و تۆکمە.

لە کۆتاییدا داوا لە مامۆستایان دەکەم بەردەوام بە ڕووی قوتابییەکان زەردەخەنەی سۆز و خۆشەویستی بکەن، بەرامبەر هەموو ڕووداو و پێشهاتەکان ئەرێنی بن، چونکە ئەمە هۆکارێکی سەرەکییە بۆ ئەوەی ببێتە هاندەر بۆ قوتابی و قوتابخانەیان خۆش بوێت.

**فوئاد جاسم مەلابرایم          هەولێر- مێرگەسۆر**

فوئاد مامۆستایە لە زانکۆی سەڵاحەدین، یاریدەدەری ڕاگرە لە کۆلێژی پەروەردەی بنەڕەتی، بەم شێوەیە باس لە ئەزموونی ژیانی خۆی دەکات کاتێك لە بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتی قوتابی بووە.

ئارەزووی هەموو منداڵێك گەیشتن بە قوتابخانەیە، چونکە لەم قۆناغە دەچێتە ناو کۆمەڵگە و ئاشنا دەبێت بە دونیای زانست و فێربوون، هەستێکی هێندە تایبەت و خۆشم هەبوو ناتوانم دەری ببڕم، قوتابخانە ماڵێکی ئاسوودە و دڵگیر بوو بۆ من.

بە شێوەیەکی گشتی هەڵسوکەوتی مامۆستاکان زۆر باش بوو، وەك سروشتی ژیانیش مامۆستا هەبوو هەڵسوکەوتی توند و قسەی ڕەق بوو، ئەمەش وای کردبوو نەتوانێت لەگەڵ تەمەنی ئێمە بگونجێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم توندییەی هەندێك لە مامۆستاکان هۆکاری ئاژاوە و جوولەجوولی ئێمە بوو.

کاتێك باوکم گۆڤاری (گوڵان و دەنگی پێشمەرگە)ی دەهێنایە ماڵەوە، تەنیا سەیری وێنەکانم دەکرد و نەمدەزانی هیچ شتێك بخوێنمەوە، زۆر جار وێنەیەك سەرنجی ڕادەکێشام، داوام لە باوکم، یان براکەم دەکرد بۆم بخوێنێتەوە، لەو کاتەوە ئارەزووی فێربوون و خوێندنەوەم زیاتر بوو.

ئەوەی زۆر ئازاری دەدام بریتی بوو لە جیاوازی کردن لە نێوان ئێمە و منداڵی مامۆستاکان کە لەگەڵ ئێمە قوتابی بوون، زۆر جار ئەو منداڵانە



لەلایەن دایك و باوکیان بەسەر ئێمەدا فەرز دەکران، چونکە مامۆستای قوتابخانەکەمان بوون.

لەگەڵ ئەمەشدا سەرزەنشتکردنی ئێمە بەهۆی هەڵەیەکی بچووك، هۆکارێکی تر بوو بۆ ئەوەی ئارەزووی خوێندن و قوتابخانمان نەمێنێت.

زۆر جار بیرم دەکردەوە و دەمگوت بە سکی برسی و پێڵاوی دڕاو و جلی شەپ و شۆڕ فێربوون ڕوونادات و قوتابخانە تەواو ناکرێت، بەڵام ڕۆژگار فێری کردم کە نەبوونی و برسیەتی و بارودۆخی خراپ و ناخۆش گەورەترین قوتابخانە و مامۆستان.

مامۆستا هونەرمەندە، دەتوانێت بە گوفتار و ڕەفتارە باشەکانی دواڕۆژێکی باش بۆ قوتابییان فەراهەم بکات، داوا لە مامۆستایان دەکەم کێشە تایبەتییەکانی خۆیان بۆ ژووری خوێندن نەبەن و بارودۆخێکی ناسەقامگیر لە پۆل نەڕەخسێنن بەهۆی کێشەی تایبەتی خۆیان، نابێت بارودۆخی کۆمەڵایەتی و سیاسی لە ڕەفتاری مامۆستا ڕەنگبداتەوە، خراپترین شت کە بەشێك لە مامۆستایان ڕێگای پێ دەدەن بریتییە لە بڵاوکردنەوەی بیری نەرێنی لای قوتابییان.

کاتێك پۆلی یەك بووم، لە زمانی کوردی وانەی (دۆی دادە)مان دەخوێند، مامۆستای بابەت ناوی ئیسماعیل بوو، دۆی هێنابووە پۆل بۆ ئەوەی وانەکە بە پراکتیکی بکات و کەشێکی ئەکادیمی دروست بکات، تا ئێستاش تامی ئەو دۆیە لە دەمم ماوەتەوە، داوا دەکەم مامۆستایان هەموو بابەتەکان بە شتی بەرجەستە و بەردەست ببەستنەوە، بۆ ئەوەی بتوانن کەشێکی لەبار دروست بکەن و وانەکە ببێتە بەشێك لە ژیانی ئەکادیمی قوتابی و لە بیری نەچێتەوە.

**هێمن عەبدولعەزیز هەولێر- بارزان**

هێمن مامۆستایە لە زانکۆی نۆلیج، لەگەڵ ئەوەشدا قوتابیی دکتۆرایە لە تورکیا، بەم شێوەیە باس لە ئەزموونی خۆی دەکات کاتێك لە بازنەی یەکەمی خوێندنی بنەڕەتی قوتابی بووە.

سەرەتای ژیانی ئەکادیمی و خوێندنم لە گوندێکی دورەدەستی ئەم نیشتمانە جوان و ڕەنگینە دەستی پێکرد، لەگەڵ دەستکردن بە خوێندن هەستێکی زۆر خۆش و تایبەتم هەبوو، چونکە تازە قوتابخانە لە گوندەکەمان کرابووەوە.

قوتابخانەکەمان خانوویەکی سەرخۆڵ بوو، بەڵام پڕ بە دڵ و هەستم دەستم بە خوێندن کرد، قوتابخانەکەمان پڕ بوو لە میهرەبانی و سۆز و خۆشەویستی.

تا ئێستاش ئەو ساتەم لەپێش چاو ماوە کاتێك چووم بۆ قوتابخانە مامۆستایەکی کرستیان زۆر بە هێمنی و ڕوویەکی خۆشەوە پێشوازیی لێکردم.

بە شێوەیەکی گشتی هەڵسوکەوتی مامۆستاکان زۆر باش بوو لەگەڵمان، تا ئێستاش ڕێز و خۆشەویستیم بۆ ئەو مامۆستایانە هەیە.

لەو خوێندنگا دوورەدەستەی بناری چیای شیرین ئەوەی هانی منی دەدا بۆخوێندن دایك و باوکم بوون، چونکە ئەوان خوێندەوارێکی باش نەبوون، بەهەر شێوەیەك بێت دەیانویست من بخوێنم و هەوڵ بدەم.



سەرەڕای هەڵسەکەوتی باشی مامۆستاکان، بەڵام جیاوازیکردن لە نێوان قوتابییەکان هەستێکی ناخۆشی لای ئێمە دروست دەرکرد.

مرۆڤ تا لە ژیان بێت هەر قوتابییە، چونکە بەردەوام پێویستی بە فێربوونە، پێشنیاز دەکەم مامۆستاکان فێربوون بۆ قوتابی بکەن بە ئامراز بۆ بەرەوپێشبردنی کۆمەڵگا، نەك تەنها خوێندن بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامە بێت.

شێوازی وانەگوتنەوە ڕۆڵێکی باڵای لە بەرەوپێشبردنی خوێندن و تێگەیشتن هەیە، بە گشتی شێوازی وانەگوتنەوە و هەڵسوکەوتی هەندێك مامۆستا بەردەوام هانیان دەدام بۆ فێربوون و هەوڵدان، کەواتە هەڵبژاردنی شێوازی وانەگوتنەوەی گونجاو کاریگەریی ئەرێنیی لە سەر بیرکردنەوە و هەوڵدانی قوتابی هەیە.

## شیکردنەوەی نموونەکان و دەستنیشانکردنی هۆکارەکان

### هۆکارە ئەرێنییەکان

١- باشیی مامۆستاکان.

٢- مامۆستاکان گرینگییەکی زۆریان بە پەروەردەی قوتابی دەدا.

٣- بەکارهێنانی شێوازی گونجاوی وانەگوتنەوە.

٤- گرینگیدان بە بیرکردنەوەی قوتابی.

٥- بەستنەوەی وانەکان بە ڕووداوەکانی دەرەوە.

٦- هەوڵدان بۆ زانینی ئارەزووەکانی قوتابی بۆ ئەوەی گرینگیی پێ بدەن.

٧- هەڵسوکەوتی باشی مامۆستاکان.

٨- هاندانی دایك و باوك بۆ خوێندن.

٩- دڵخۆشیی مامۆستا.

١٠- هاندانی قوتابی بۆ خوێندن.

١١- بوونی کتێبی زۆر.

١٢- خوێندنەوەی چیرۆك.

١٣- بوونی هاوڕێی باش.

١٤- هاندانی بەردەوام.

١٥- بوونی کەرستەی بەرجەستە لە قوتابخانە.



### هۆکارە نەرێنییەکان

١- گاڵتەپێکردنی بەردەوام لەلایەن قوتابی و هاوپۆلەکان.

٢- وەڵامنەدانەوەی پرسیاری قوتابی لەلایەن مامۆستا.

٣- نەزانینی کاتی کۆتاییهاتنی قوتابخانە.

٤- شارەزا نەبوون لە هەڵسوکەوتی مامۆستا.

٥- ترس و دڵەڕاوکێ.

٦- توڕەبوونی مامۆستا.

٧- سزادانی جەستەیی قوتابی لەلایەن مامۆستا.

٨- بەکارهێنانی ڕێگای کلاسیکی وانەگوتنەوە.

٩- هەوڵنەدان بۆ بیرکردنەوەی قوتابی.

١٠- نەزانینی ناوی هەموو قوتابییەکان لەلایەن مامۆستا.

١١- جیاوازیکردن لە نێوان قوتابییان.

١٢- گرینگینەدان بە قوتابی.

١٣- گرینگینەدان بە بیرۆکەکانی قوتابی.

١٤- بێمنەتیی مامۆستا لە قوتابی.




**مێلگرافی قوتابخانەکانی بەشداربوو لە ڕاپرسی**




**مێلگرافی ئەو شار و ناوچانەی لە هەولێر بەشدارییان لە ڕاپرسی کردووە**




**مێلگرافی هۆکارە ئەرێنی و نەرێنییەکانی نموونەکان**




**مێلگرافی ئەو وڵاتانەی بەشدارییان لە ڕاپرسی کردووە**

# بەشی سێیەم

## ڕێنمایيە دەروونی و پەروەردەییەکان بۆ سەرخستنی

## ڕێگاکانی وانەگوتنەوەی سەردەمی

فێربوون چییە؟

مەرجەکانی فێربوون

ڕێنمایی و ئاراستەکردن

سستیی فێربوون چییە؟

هۆکارەکانی سستیی فێربوون

چارەسەرکردنی سستیی فێربوون

مامۆستا چۆن دەتوانێت ئەو قوتابییە بدۆزێتەوە کە تووشی سستیی فێربوون بووە؟

ڕێنمایی دەروونی بۆ قوتابییان

تایبەتمەندییەکانی پسپۆڕی دەروونی

گرینگیی ڕێنمایی دەروونی بۆ قوتابییان

ڕێنمایی دەروونی لە چ کاتێکدا پێویستە؟

ڕێنمایی دەروونی بۆ؟

ئامانجەکانی ڕێنمایی دەروونی

چی بکەین بۆ ئەوەی مامۆستایەکی باش بین؟

بنەماکانی ڕێنمایی دەروونی

## فێربوون چییە؟

فێربوون بریتییە لە وەرگرتنی دابونەریت و زانیاری و ئەو بیرۆکانەی تاك دوای لە دایك بوون فێریان دەبێت، ئەمیش بە ڕێگای مامەڵەکردنی لەگەڵ ئەو ژینگە کۆمەڵایەتییەی کە تێیدا دەژیت و گەورە دەبێت، چونکە ژینگەی کۆمەڵایەتی کاریگەریی زۆری لە سەر فێربوونی تاك هەیە لە هەموو بوارە جیاجیاکانی ژیان.

لە دەروونزانیدا فێربوون بریتییە لەو گۆڕانکارییانەی کە بەسەر ڕەفتاری بوونەوەر و مرۆڤدا دێن.

فێربوون تەنیا ئاستی خوێندن و کۆششکردنی ڕۆژانە نییە، بەڵکو فێربوون بریتییە لەو گۆڕانکارییانەی کە لە ڕەفتاری مرۆڤ ڕوو دەدەن، منداڵ لەگەڵ لەدایکبوونی بەرە بەرە زۆرێك لە دابونەریتە جوولەیی و زەینی و دەروونی و کۆمەڵایەتییەکان فێر دەبێت، هەروەها فیر دەبێت چۆن خۆی لەو ڕووداوە مەترسیدارانە بپارێزێت کە ڕووبەڕووی دەبنەوە، لەگەڵ ئەمانەشدا مرۆڤ فێری تووڕەبوون و هەڵچوون دەبێت (جەباری، ٢٠٠٩: ١٧).

بەڵام لە قوتابخانەدا فێربوون بریتییە لە وەرگرتنی ئەو یاسا و ڕێسا تایبەتیانەی کە پێویستە بۆ ئاشنابوون بە کەشی قوتابخانە، گوێڕایەڵی بۆ ئەم یاسایانە قوتابی هان دەدات بۆ ئەوەی بەردەوام ڕێز لە مامۆستا و دایك و باوکی بگرێت، تا ببێتە نموونەیەکی پێشەنگی کۆمەڵگە.

## مەرجەکانی فێربوون

مرۆڤ بەردەوام لە فێربووندایە، هیچ کاتێك ناتوانێت لە فێربوونی شتەکانی دەوروبەری بوەستێت، چونکە هەرکاتێك مرۆڤ لەهەوڵدان بۆ فێربوون وەستا ڕاستەوخۆ ژیانیشی دەوەستێت و بەردەوام بەدوای بازنەیەکدا خول دەخوات بێ ئەوەی هیچ دەستەکەوت و بەرهەمێکی بۆ خۆی و دەوروبەری هەبێت.

فێربوون کۆمەڵێك مەرجی هەیە، پێویستە گرینگی بەم مەرجانە بدرێت، مەرجەکانی فێربوون زۆر و جۆراوجۆرن، لێرەدا هەوڵ دەدەین باسی چەند مەرجێکیان بکەین کە بریتین لە (مەرجی دووبارەکردنەوە، مەرجی پاڵنەر، مەرجی چێژوەرگرتن، مەرجی پاداشت و سزا، مەشقکردن و ڕاهێنان، گوێگرتنی خودی)(جەباری، ٢٠٠٩: ٢١-٢٤).

### ١- مەرجی دووبارەکردنەوە

قوتابی بەردەوام پێویستی بە دووبارەکردنەوەی ئەو بابەتە هەیە کە بۆ فێربوون و بەدەستهێنانی شارەزاییەکی دیاریکراو پێویستیەتی، مەبەست لە دووبارەکردنەوە پێداچوونەوەی ئاڕاستەکراو و ئەکادیمییە بۆ بابەتی خوێندراو، بۆ ئەوەی ببێتە هۆی فێربوونی تەواو و قوتابی لەبیری نەچێت.

بۆ ئەوەی قوتابی بە باشی فێر ببێت پێویستە چەند جارێك ئەو بابەتەی بۆ دووبارە بکرێتەوە کە بڕیارە فێر بکرێت.



مەرج نییە دووبارەکردنەوە لەو ڕۆژە بێت کە وانەکەی تێدا دەخوێندرێت، بەڵکو پێویستە لە وانەی دواتر و ڕۆژی دواتر پێش دەستکردن بە بابەتی تازە بابەتە کۆنەکەی بۆ دووبارە بکرێتەوە، چونکە دووبارەکردنەوە دەبێتە هۆی بیرهێنانەوە و گەشەکردن و بەرەوپێشبردنی زانیاری و پەیداکردنی شارەزایی لە سەر بابەتی خوێندراو.

پێویستە مامۆستا بۆ کرداری فێربوون ڕێگایەکی دروست بگرێتە بەر بۆ دووبارەکردنەوەی بابەتی خوێندراو.

### ٢- مەرجی پاڵنەر

پاڵنەر مەرجێکی گرینگە بۆ بەردەوامیدان بە پرۆسەی فێربوون و خوێندن، مەرجی پاڵنەر قوتابی و مامۆستا بۆ بەردەوامی و گەڕان بەدوای نوێترین سەرچاوەی بەردەست هان دەدات، پێویستە پاڵنەرەکانی فێربوون پاڵنەری باش بن و ببنە مایەی هەستکردن بە ئاسوودەیی.

دەبێت پرۆسەی فیربوون لە بارودۆخێکی خۆش و پڕ لە ئاسوودەیی بەڕێوە بچێت، ئەمەش بە دروستکردنی کەشێکی لەبار و گونجاو دروست دەبێت، چونکە پاڵنەری خراپیش بۆ فێربوون هەیە، بۆ نموونە فێربوون لە ڕێگای ترس و لێدان، ئەم جۆرە فێربوونە دەبێتە هۆی ئەوەی قوتابی وانە و مامۆستاکەی خۆش نەوێت و زۆر جاریش دەبێتە هۆی ڕاکردن لە قوتابخانە.

کەواتە دەبێت لە پرۆسەی فیربووندا پەنا بۆ ترس و لێدان نەبردرێت.

### ٣- مەرجی چێژوەرگرتن

پێویستە مامۆستا بەردەوام ڕاهێنان و چالاکی بە قوتابی بکات، بۆ ئەوەی چێژ لە کرداری فێربوون وەربگرن، لەگەل ئەوەشدا پێویستە مامۆستا خولی ڕاهێنانی جۆراوجۆر ببینێت، بۆ ئەوەی بتوانێت چێژی فێربوون و سەرکەوتن لای قوتابییەکان دروست بکات و لە ترسی هەرەسهێنان و شکست دوور بکەون.

### ٤- مەرجی پاداشت و سزا

پاداشت و سزا بە کۆڵەکەی پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن دادەنرێت، پێویستە مامۆستا و پەروەردەکار بزانێت لە چ کاتێکدا قوتابی سزا دەدات و لە چ کاتێکدا پاداشتی دەکات.

بە شێوەیەکی گشتی پێویستە مامۆستا و پەروەردەکار لە پێدانی پاداشت و سزا مامناوەندی بن و زیادەڕۆیی نەکەن، چونکە زیادەڕۆیی لە پاداشت و سزا دەبێتە هۆی لەدەستدانی بەهای پاداشت و سزا.

نابێت مامۆستا سزای جەستەیی بەکار بهێنێت و ئازاری قوتابی بدات، بەڵکو ئەگەر پێویست بوو دەبێت پەنا بۆ سزادانی مەعنەوی ببات، بۆ نموونە بێبەشکردن لە چالاکیی ڕۆژانە، گرینگی پێنەدان بۆ ماوەیەکی کاتی.

سەبارەت بە پاداشت مامۆستا دەبێت کاتی پاداشت و جۆری پاداشتەکە بزانێت، کاتێك قوتابی وەڵامی پرسیارێك دەزانێت، تەنها ئەوەندەی وەڵامی پرسیارەکە پاداشتی بکات، نابێت بۆ وەڵامێکی کورت پاداشتێکی زۆری پێ بدات، یان ناکرێت پاداشت هەر دیاری و شتی ماددی بێت، بەڵکو دەکرێت پاداشت دەستخۆشی لێکردن و چەپڵەلێدان و پێداهەڵگوتن بێت.

لەگەڵ ئەوەشدا پێوستە مامۆستا کاتی پاداشتکردن بگۆڕێت و بۆ هەموو وەڵامێك قوتابی پاداشت نەکات، چونکە ئەمە وا لە قوتابی دەکات تەنها بۆ پاداشت و دەستخۆشی بخوێنێت، بەڵام ئەگەر کاتی پاداشتەکەی دیاریکراو نەبێت، قوتابی چاوەڕوانی پاداشت ناکات، واتە ئەگەر دوو، یان سێ وەڵامی ڕاست بزانێت و مامۆستا جار نا جارێك لە کاتێکی نادیار پاداشتی بکات، ئەمەش وا دەکات قوتابی بەردەوام بخوێنێت و چاوەڕوانی پاداشت نەکات.

### ٥- مەشق و ڕاهێنان

مەشق و ڕاهێنان ئارەزووی فێربوون لای قوتابی بەهێز دەکات، چونکە ڕاهێنان وەك پشوو وایە، دەبێتە هۆی هێوربوونەوەی مێشکی قوتابی و ئاسوودەیی بە ڕۆح دەبەخشێت.

بە شێوەیەکی گشتی دوو جۆر ڕاهێنان هەیە، ئەوانیش بریتین لە ڕاهێنانی دابەشکراو و ڕاهێنانی یەکجارە، ڕاهێنانی یەکجارەکی ئەو ڕاهێنانەیە کە دەبێتە هۆی ماندووبوون و بێزاربوونی قوتابی، چونکە هەموو جۆرەکانی ڕاهێنان بەسەر یەکەوە ئەنجام دەدرێن.

پێویستە مامۆستا گرینگی بە ڕاهێنانی دابەشکراو بدات، چونکە لە ڕاهێنانی دابەشکراو ماوەی پشوودان هەیە، ئەمەش دەبێتە هۆی

جێگیربوونی ئەو زانیارییانەی کە قوتابی فێریان بووە، لەگەڵ ئەوەشدا ڕاهێنان و چالاکی دەبێتە هۆی ئەوەی قوتابی بیری فراوان بێت و ئارەزووی زیاتری بۆ بابەتەکە بچێت و مامۆستاکەشی خۆش بوێت.

### ٦- گوێگرتنی خودی

گوێگرتنی خودی بریتییە لە گەڕانەوەی ئەو زانیاری و کارامەییانەی کە قوتابی فێریان بووە، قوتابی لەم ڕێگایەوە هەوڵ دەدات بزانێت تا چەند ئەو زانیارییەی کە فێر کراوە لە یادگەی ماوە و فێری بووە، نابێت قوتابی و مامۆستا لە گوێگرتنی خودی پەلە بکەن، چونکە پەلەکردن دەبێتە هۆی تێکچوونی زنجیرەی بیرکردنەوەی قوتابی.



## ڕێنمایی و ئاڕاستەکردن

بێگومان پرۆسەی فێربوون لە سەر بنەمای ڕابەرایەتی و ئاڕاستەکردن بێت زۆر باشتر و کاریگەرترە لەوەی بە شێوەی هەڕەمەکی بێت، پێویستە قوتابی هەوڵ بدات زۆرترین سوود لەو ڕێنماییانە وەربگرێت کە مامۆستا لە ناو پۆل ئاڕاستەی دەکات، جا ئەم ڕێنماییانە بۆ خوێندن و وانەکانی پەیوەست بە قوتابخانە بێت، یان ڕێنمایی بێت بۆ ژیانی قوتابی.

ئەم زانیارییانەی قوتابی لە قوتابخانە فێریان دەبێت ئەستەمە لە شوێنێکی تر بتوانێت فێریان ببێت، پێویستە مامۆستا ئاڕاستەی ڕێنماییەکانی بە لایەنی باشە بێت، نەك لایەنی خراپە.

دەبێت مامۆستا لە ئاڕاستەکردنی ڕێنمایی و ئامۆژگارییەکانیدا ڕەچاوی تەمەن و ڕەگەز و پلەی زیرەکیی قوتابییەکانی بکات، ئەگەر مامۆستا بۆ هەموو قوتابییەکانی بە یەك ئاڕاستە و شێواز ڕێنمایی پێشکەش بکات، ڕەنگە هەندێك لە قوتابییەکان نەتوانن تەواوی ڕێنماییەکان هەزم بکەن و وەری بگرن.

## سستیی فێربوون چییە؟

سستیی فێربوون بریتییە لە لاوازیی توانای فێربوونی قوتابییەك لە قوتابییەکانی هاوتەمەنی خۆی، ئەمەش لە قوتابییەکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازە.

سستیی فێربوون خۆی لە چەند بەشێکی جیاواز دەبینێتەوە وەك: توانای گوێگرتن، توانای ئاخاوتن، توانای خوێندنەوە، توانای نووسین، توانای شیکردنەوە، توانای دەربڕینی بیرۆکەکان (جەباری، ٢٠٠٩: ٢٧)

لێرەدا هەوڵ دەدەین شیکردنەوە بۆ ئەم خاڵانە بکەین کە لە سەرەوە باسمان کردن.

### ١- توانای گوێگرتن

مەبەست لە توانای گوێگرتن هێزی بیستنی قوتابییە بۆ بابەتی دیاریکراو و باسکراو لە پۆلدا، چەند قوتابی توانای گوێگرتنی زۆرتر بێت ئەوەندە توانای فێربوونی زیاتر دەبێت.

بەڵام ئەگەر قوتابی توانای گوێگرتنی باش نەبێت و نەتوانێت بۆ ماوەیەکی دیاریکراو گوێ بۆ مامۆستا بگرێت، ناتوانێت سەرجەم بابەتەکان بەتەواوی و وەك خۆی وەربگرێت، لەم بارەشدا قوتابی تووشی سستیی فێربوون دەبێت و لە قوتابییەکانی هاوتەمەنی خۆی دوا دەکەوێت.



### ٢- توانای ئاخاوتن

توانای ئاخاوتن بەندە بە توانای گوێگرتن، ئەگەر قوتابی گوێگرێکی باش بێت، بێگومان توانای ئاخاوتنی باش دەبێت و دەتوانێت بە ئاسانی بیر و بۆچوونی خۆی دەربارەی ئەو بابەتە دەرببڕێت کە گوێبیستی بووە.

بەڵام ئەگەر قوتابی توانای ئاخاوتنی باش نەبێت، بە شێوەیەکی گشتی لە قوتابییەکانی هاوشێوەی خۆی دوا دەکەوێت، بەتایبەت لەو بابەتانەی کە پێویستە قوتابی گفتوگۆیان تێدا بکات.

### ٣- توانای خوێندنەوە

توانای خوێندنەوە پەیوەندییەکی پتەوی بە توانای گوێگرتن و ئاخاوتن هەیە، چونکە هەر قوتابییەك توانای گوێگرتن و ئاخاوتنی باش نەبێت ئەوا بێگومان توانای خوێندنەوەی نابێت.

ئەگەر قوتابی لە قۆناغەکانی سەرەتاییدا نەتوانێت فێری پیتەکان و ئەو وشانە بێت کە فێر کراوە، بەدڵنیاییەوە لە قوتابییەکانی هاوپۆلی خۆی دوا دەکەوێت، ئەمەش بە سستیی فێربوون لە قەڵەم دەدرێت.

## ٤- توانای نووسین

بێگومان توانای نووسین لایەنێکی گرینگە بۆ ئەوەی قوتابی بتوانێت ببێت بە هاوشانی هاوپۆلەکانی، چونکە ناکرێت قوتابی لە نووسین لاواز بێت، مەبەستمان لە توانای نووسین بریتییە لە نووسین بە پێی ئەو قۆناغەی کە تیایدا دەخوێنێت، چونکە لە هەر قۆناغێکدا قوتابی کۆمەڵێك بابەت و وشە و ڕستەی نوێ فێر دەبێت.

قوتابی پێویستە توانای نووسینی ئەو وشە و دەستەواژانەی هەبێت کە تایبەتن بەو قۆناغەی کە تیایدا دەخوێنێت، واتە ناکرێت قوتابی زۆری لێبکرێت هەندێك وشە و دەستەواژە بنووسێت کە تایبەت نین بەو قۆناغەی کە ئێستا تیایدا دەخوێنێت.

هەر قوتابییەك توانای نووسینی ئەو وشە و ڕستە و دەستەواژانەی هەبێت کە تایبەتن بەو قۆناغەی تیایدا دەخوێنێت ئەوا قوتابییەکی ئاساییە، بەڵام ئەگەر توانای نووسینی ئەو وشە و ڕستانەی نەبێت کە تایبەتن بەو قوناغەی تیایدا دەخوێنێت، ئەو قوتابییە تووشی سستیی فێربوون بووە.

## ٥- توانای شیکردنەوە

توانای شیکردنەوە بریتییە لە: شیکردنەوەی ئەو بابەتانەی کە تایبەتن بەو قۆناغە دیاریکراوەی کە قوتابی تیایدا دەخوێنێت.

شیکردنەوەی بابەتەکان دیاریکراو و پوختن، ناکرێت لە قۆناغی بنەڕەتیدا داوا لە قوتابی بکرێت بابەتێکی گران شی بکاتەوە، بەڵکو دەبێت شیکردنەوەی بابەتەکان بە پێی قۆناغی خوێندن و ئاستی تێگەیشتنی قوتابی بێت.



## ٦- توانای دەربڕینی بیرۆکەکان

قوتابی لە قۆناغی بنەڕەتیدا بە تایبەتی لە بازنەی یەکەمدا ئەستەمە بتوانێت بیرۆکەکانی ڕیك بخات و دەریان ببڕێت، مەگەر قوتابییەك لە بنەڕەتەوە زیرەك بێت و توانای دەربڕینی هەبێت.

لە سەر مامۆستا پێویستە قوتابییەکانی فێری ئەوە بکات، چۆن بیرۆکەکانیان ڕێك بخەن و لە شێوەی وشە و دەستەواژەی گەنجاو و دروست دەریان ببڕن.

بەڵام ئەگەر قوتابییەك توانای دەربڕینی نەبێت و لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵەکانی مامۆستا بۆ فێربوون و دەربڕین سەرنەگرێت و ڕێنماییەکانی مامۆستا وەرنەگرێت، ئەوا قوتابی بە سستیی فێربوون هەژمار دەکرێت، چونکە لە قوتابییە هاوپۆلەکانی خۆی دوا دەکەوێت.

## هۆکارەکانی سستیی فێربوون

کۆمەڵێك هۆکار بۆ سستیی فێربوون هەیە، هەندێك هۆکار چارەسەر دەبن و دەتوانرێت لە ڕێگای پسپۆڕ و پزیشکی تایبەتەوە چارەسەری گونجاویان بۆ بدۆزرێتەوە، بەڵام هەندێك کات گرفتە بۆماوەییەکان و زگماکییەکان بە ئەستەم چارەسەر دەکرێن، لێرەدا هەوڵ دەدەین هۆکارەکانی سستیی فێربوون بخەینە ڕوو.

١- بابەتی زۆر و جۆراوجۆر یەکێکە لە هۆکارەکانی سستیی فێربوون، ئەمەش کێشەیەکی گەورە بۆ سەرجەم قوتابییانی قۆناغە جیاوازەکان دروست دەکات و دەبێتە هۆی دروستبوونی فشارێکی زۆری دەروونی و جەستەیی بۆ قوتابی، چونکە قوتابی ناتوانێت بە کاتێکی کەم هەموو بابەتەکان هەزم بکات و پێداچوونەوەی وردیان بۆ بکات.

لەم بارەدا قوتابی تووشی دڵەڕاوکێ و قەلەقی دەبێت، ئەگەر قوتابی نەتوانێت بەسەر زۆری بابەتەکاندا زاڵ بێت، تووشی توانج و قسەی نەشیاوی مامۆستا و قوتابییەکانی تر دەبێت، ئەمەش وا دەکات قوتابخانە جێبهێڵێت، جێهێشتنی قوتابخانە لای خەڵك و مامۆستا و قوتابییەکانی تری قوتابخانە بە سستیی فێربوون هەژمار دەکرێت.

٢- کەموکوڕیی هەستی بیستن و بینین یەکێکی ترە لە هۆکارەکانی سستیی فێربوون، هەندێك کات کەموکوڕی لە هەستی بیستن و بینین لەلایەن کەسی پسپۆڕ و دکتۆر چارەسەر دەکرێت.

بەڵام ئەگەر چارەسەری نەبوو، ئەوا قوتابی تووشی سستیی فێربوون



دەبێت و لە قوتابییەکانی هاوپۆلی خۆی دوا دەکەوێت.

٣- لێکپچڕانی خێزانی و کێشەی کۆمەڵایەتی هۆکارێکی تری سستیی فێربوونە، بەهۆی کێشەی خێزانی و کۆمەڵایەتییەوە قوتابی تووشی جۆرەها کێشەی دەروونی و ئازاری ویژدانی دەبێت، ئەمەش هۆکارێکی سەرەکییە بۆ سستیی فێربوون.

لەم بارەشدا قوتابی پێویستی بە ڕاوێژی تەندروستی و دەروونی دەبێت بۆ ئەوەی تووشی نەخۆشیی دەروونی نەبێت و چارەسەری پێویستی بۆ بکرێت، تا بتوانێت دەست بە ژیانی ئاسایی خۆی بکاتەوە و ببێتەوە بە بەشێك لە ئەندامانی کۆمەڵگە، ئەمەش زیاتر بە ڕاوێژی پسپۆڕی کۆمەڵایەتی و دەروونی چارەسەر دەکرێت.

٤- کەموکوڕیی جەستەیی هۆکارێکی تری سستیی فێربوون و دواکەوتنە لە خوێندن، چونکە کەموکوڕیی جەستەیی ڕاستەوخۆ کاریگەری لە سەر لایەنی دەروونیی قوتابی دروست دەکات، بەتایبەت ئەگەر ئەم کەموکوڕییە ببێتە جێی گاڵتەی هاوپۆلەکانی.

٥- ژینگەی ناتەواوی فیزیایی پۆل هۆکارێکی سەرەکیی سستیی فێربوون و بێزاربوونە لە پۆل و خوێندن، چونکە ئەگەر مامۆستا نەتوانێت کەشێکی لەبار بۆ قوتابی دروست بکات، بە دڵنیاییەوە کاریگەریی نەرێنی لە سەر قوتابییان دەبێت و سستیی فێربوون لای کۆمەڵێك قوتابی دروست دەبێت.

٦- کێشەی دەروونی هۆکارێکی سەرەکیی سستیی فێربوونە، چونکە ئەگەر قوتابییەك کێشەی دەروونیی هەبێت ڕاستەوخۆ تووشی سستیی فێربوون

دەبێت و ئاستی زیرەکی و هۆشیاریی لە قوتابییەکانی تر کەمتر دەبێت، بۆیە پێویستە منداڵی تووشبوو بە نەخۆشی و گرێی دەروونی چارەسەر بکرێت بۆ ئەوەی بتوانێت دەست بە ژیانی ئاسایی خۆی بکاتەوە، وەك هەر قوتابییەکی هاوتەمەنی خۆی.

٧- شێوازی وانەگوتنەوە هۆکارێکی ترە قوتابی تووشی سستیی فێربوون دەکات، ئەگەر مامۆستا شارەزاییەکی تەواوی لە ڕێگاکانی وانەگوتنەوە نەبێت، ئەوا قوتابی تووشی گرفت و کێشە دەبێت و ناتوانێت بابەت و بیرۆکە باسکراوەکان وەربگرێت و هەزمیان بکات.

کەواتە شێوازی وانەگوتنەوەی گونجاو هۆکارێکی سەرەکیی فێربوونە، ئەگەر مامۆستا شێوازێکی گونجاو و نوێ بەکار نەهێنێت قوتابی تووشی سستیی فێربوون دەبێت.

٨- هەبوونی بۆشایی لە نێوان بابەتە تیۆری و پراکتیکییەکان هۆکارێکی سەرەکیی سستیی فێربوونە، ئەگەر بۆشایی دروست بێت قوتابی بیرۆکەکانی پەرتەوازە دەبن و ناتوانێت شێوازی ڕاڤەکردنی مامۆستا بۆ بابەتە تیۆری و پراکتیکییەکان بە یەکەوە ببەستێتەوە.

کەواتە نەبوونی توانای بەیەکەوەبەستنەوە لە ئەنجامی ئەم بۆشاییە دروست دەبێت کە هەیە، ئەمەش هۆکارێکە بۆ سستیی فێربوون.

٩- بەکارنەهێنانی پاداشت و هاندان لە پۆلدا هۆکارێکی تری سستیی فێربوونە، هەبوونی پاداشت دەبێتە لایەنێکی سەرەکیی پرۆسەی فێربوون بۆ ئەوەی قوتابی هێز و متمانەی بۆ دروست بێت و بەردەوام بێت لە سەر



زیرەکی و خوێندنیدا، بەڵام پێویستە مامۆستا بزانێت لە چ کاتێك و بە چ شێوەیەك قوتابی پاداشت دەکات.

نابێت مامۆستا بەردەوام بۆ هەموو وەڵامێکی گونجاو و دروست پاداشت بە قوتابی بدات، چونکە ئەمە دەبێتە هۆکاری ئەوەی قوتابی تەنها بۆ پاداشت بخوێنێت.

بەڵکو پێویستە مامۆستا بەشێوەی هەڕەمەکی لە نێوان چەند وەڵامێکی ڕاست جار نا جارێك پاداشتی قوتابییەکان بکات بۆ ئەوەی قوتابی نەزانێت چ کاتێك پاداشت دەکرێت، ئەمەش ڕێگایەکی گونجاو و سەردەمییە بۆ ئەوەی قوتابی بەردەوام بێت و تەنها بۆ پاداشت و هاندان نەخوێنێت.

## چارەسەرکردنی سستیی فێربوون

سستیی فێربوون وەك هەر کێشەیەکی تری ژیانی مرۆڤ دەشێت چارەسەری هەبێت و دووبارە قوتابی بگەڕێتەوە بۆ باری ئاسایی پێشوو، تا بتوانێت دەست بە ژیانی ئاسایی خۆی بکاتەوە و بگاتەوە ئاستی قوتابییەکانی هاوتەمەنی.

لێرەدا هەوڵ دەدەین بە چەند خاڵێك باسی چارەسەکردنی سستیی فێربوون بکەین کە بریتین لە:

١- دەستنیشانکردنی شێوازێکی وانەگوتنەوەی گونجاو و سەردەمی بۆ ئەوەی لەگەڵ توانای قوتابییان بگونجێت.

ڕێگای وانەگوتنەوەی گونجاو گرفتی سستیی فێربوون چارەسەر دەکات، قوتابی بۆ ئەوەی بتوانێت بابەتی ڕۆژانە و زانیاری و ئامۆژگارییەکانی مامۆستا بە تەواوی وەربگرێت و هەزمی بکات پێویستی بەشێوازێکی دروستی وانەگوتنەوە هەیە.

ڕێگاکانی وانەگوتنەوە زۆر و جۆراوجۆرن، هەر ڕێگایەك بۆ قۆناغ و بابەتێك گونجاوە، بۆیە پێویستە مامۆستا ئەو ڕێگایە هەڵبژێرێت کە بۆ قوناغێکی دیاریکراو گونجاوە، بۆ ئەوەی زۆرترین لێکتێگەیشتن لە نێوان خۆی و قوتابییەکانی دروست بێت.

٢- هەبوونی هاوکاری و هەماهەنگی لە نێوان قوتابی و مامۆستا و کەسوکاری قوتابی، چونکە هەندێك کات سستیی فێربوون لە ئەنجامی نەبوونی متمانەی تەواو و ترس و دڵەڕاوکێی قوتابی دروست دەبێت، لەم بارەدا پێویستە هەموو لایەك هەوڵ بدەن پلانێکی دروست و گونجاو دابنێن بە مەبەستی چارەسەرکردنی سستیی فێربوون، بەم شێوەیەش بە هاوکاریی هەموو لایەك متمانە بۆ قوتابی و مامۆستا دروست دەبێتەوە.

٣- دەستنیشانکردی کێشەکانی منداڵی تووشبوو بە سستیی فێربوون، چونکە تا دەستنیشانی ئەو کێشەیە نەکرێت چارەسەرکردن زۆر ئەستەمە، بۆیە پێویستە مامۆستا و خێزان پێش هەموو شتێك ئەو کێشەیە دەستنیشان بکەن، کە قوتابیی تووشی سستیی فێربوون کردووە.



## مامۆستا چۆن دەتوانێت ئەو قوتابییە بدۆزێتەوە، کە تووشی سستیی فێربوون بووە؟

بەدواداچوون بنەمایەکی سەرەکی و گرینگە بۆ ئەوەی مامۆستا بتوانێت دەستنیشانی قوتابیی تووشبوو بە سستیی فێربوون بکات، چونکە یەکێك لە بنەما گرینگەکان و کۆڵەکەکانی ڕێگاکانی وانەگوتنەوە بەدواداچوونە، مامۆستا پێویستە بەردەوام بە شێوەیەکی زانستی بەدواداچوون بۆ ئاستی قوتابییەکانی بکات، تا دڵنیابێت کە قوتابییەکانی لە بابەتەکە تێگەیشتوون، لە لایەکی تر ئەم بەدواداچوونە دەبێتە فیدباك بۆ خۆی و بۆ ئەو ڕێگایەی کە بۆ وانەگوتنەوە بەکاری هێناوە.

## ڕێنمایی دەروونی بۆ قوتابییان

ڕێنمایی دەروونی یەکێکە لە بنەما گرینگەکانی وانەگوتنەوەی سەردەم، بە تایبەت بۆ ئەو کاتانەی کە قوتابی تووشی گرفت و کێشەیەکی خێزانی، کۆمەڵایەتی، تەندروستی دەبێت، ئەگەر لە سەرەتای هەستکردن بەم کێشەیە هەوڵی چارەسەرکردنی نەدرێت، ڕەنگە کێشەکە ببێتە گرێیەکی دەروونیی گەورە و چارەسەرکردنی ئەستەم بێت.

ڕێنمایی دەروونی نەك تەنها بۆ قوتابی پێویستە، بەڵکو بۆ مامۆستایان و خانەوادەی قوتابییانیش پێویستە.

کەواتە ڕێنمایی دەروونی هۆکارێکی کاریگەرە بۆ دروستکردنی کەشێکی تەندروست و لەبار بۆ قوتابی و پەروەردەکار، لەم ڕێگایەشدا دەتوانرێت نەوەیەکی بەهێز و بەتوانا بۆ کۆمەڵگە پەروەردە بکرێت و لە دوارۆژدا پشت بە تواناکانیان ببەستین.

ڕێنمایی دەروونی بریتییە لە: پەیوەندی پسپۆڕی دەروونی لەگەڵ قوتابی و مامۆستا، هەروەها پەیوەندی مامۆستا و کەسوکاری قوتابییان، کە تیایدا کەسی پسپۆڕ بەردەوام هاریکاری پێشکەش دەکات و هەوڵ دەدات بە باشترین شێوە چارەسەری گرفتەکان بکات.



## تایبەتمەندییەکانی پسپۆڕی دەروونی

پێویستە پسپۆڕی دەروونی کەسێکی بەئەزموون و خاوەن بڕوانامە بێت لە پسپۆڕییەکەی خۆی، هەروەها دەبێت هونەری مامەڵەکردن بزانێت و بتوانێت بەسەر ئەو گرفت و کێشانەدا زاڵ بێت کە دێنە پێش قوتابی، پێوستە کەسی پسپۆڕ هەوڵ بدات بە باشترین شێوە و کەمترین زیان کێشەکان چارەسەر بکات.

پسپۆڕی دەروونی دەبێت کۆمەڵێك ڕۆڵی هەبێت و هەریەك لەم ڕۆڵانە گرینگی و کاریگەریی خۆی هەیە و دەبێت پشتگوێیان نەخات، ئەم ڕۆڵانە بریتین لە:

1- ڕۆڵی خۆپاراستن
2- ڕۆڵی چارەسەرکردن
3- ڕۆڵی گەشەدان بە تواناکانی تاك
4- ڕۆڵی بێلایەنی
5- نهێنیپارێزی (قەرەداغی، ٢٠٠٩: ١)

**١- ڕۆڵی خۆپاراستن:** پێویستە کەسی پسپۆڕ خۆپارێزی لە هەر ڕووداوێکی نەخوازراو بکات، چونکە کەسی تووشبوو بە گرێی دەروونی لە بارودۆخێکی

دەروونیی ناجێگیردا دەژیت و پێویستی بە چارەسەر هەیە، بەڵام زۆربەی کات کەسی نەخۆش، یان تووشبوو بە گرێی دەروونی چارەسەری پێخۆش نییە و نایەوێت وەك کەسێکی نەخۆش سەیر بکرێت، یان نایەوێت هیچ کەسێك ڕێنمایی بکات، لەم بارەشدا ڕەنگە هەوڵ بدات زەبرێك لە دەوروبەرەکەی بدات، بۆیە پێویستە پسپۆڕی دەروونی لە مامەڵەکردن و پێدانی ڕێنماییدا وردبێت.

**٢- ڕۆڵی چارەسەرکردن:** پێویستە کەسی پسپۆڕ زانیاری و ڕۆڵبینینی تەنها بۆ کاتکوشتن نەبێت، بەڵکو دەبێت کاریگەریی ئەرێنیی لە سەر کەسی نەخۆش، یان تووشبوو بە گرێی دەروونی هەبێت.

**٣- ڕۆڵی گەشەدان بەتواناکانی تاك:** پێویستە پسپۆڕی دەروونی لەگەڵ بەخشینی ڕێنمایی ڕۆڵ ببینێت بۆ ئەوەی گەشە بە تواناکانی تاك بدات، بەشێوەیەك هەوڵ بدات ڕێنماییەکانی تەنها بۆ ئەو کەسە نەبێت کە تووشی گرێی دەروونی بووە، بەڵکو ئەم ڕێنماییانە هەوڵێك بن بۆ ئەوەی کەسی تەندروست سوود لە ڕێنماییەکانی وەربگرێت بۆ کاتی پێویست و لەناکاو.

**٤- ڕۆڵی بێلایەنی:** دەبێت کەسی پسپۆڕ هەمیشە بێلایەن بێت و خۆی لە کاتی چارەسەکردنی کێشەدا بە لایەنگری کەس نەزانێت، چونکە هەر پسپۆڕێکی دەروونی نەتوانێت بێلایەنیی خۆی بپارێزێت متمانەی خەڵکی لەدەست دەدات و خەڵك بۆ هیچ بارودۆخێك پرس و ڕاوێژی پێ ناکەن.

**٥- نهێنیپارێزی:** پسپۆڕی دەروونی دەبێت نهێنیپارێز بێت، ڕەنگە کەسی تووشبوو بە گرێی دەروونی لە کاتی بێ ئاگایی هەندێك وشە و دەستەواژەی



نەشیاو بەکار بێنێت، یان ڕەنگە باسی هەندێك شتی تایبەتی بکات، لەم بارەدا پێویستە پسپۆڕ بە هەموو شێوەیەك هەوڵی پاراستنی نهێنییەکانی بدات.

## گرینگیی ڕێنمایی دەروونی بۆ قوتابییان

١- هەلێکی باش دەدات بە قوتابی بۆ ئەوەی باس لە کێشە و گرفتەکانی بکات، پسپۆڕی دەروونی هاوکاریی قوتابی دەکات بۆ دەستنیشانکردنی کێشەکان، بە مەبەستی ڕێکخستن و چارەسەرکردنیان لە ڕێگای ڕێنماییەوە.

٢- بەخشینی توانا بە قوتابی بۆ تێگەیشتن و چارەسەرکردنی کێشە تایبەتییەکانی.

٣- هاوکاریی قوتابی دەکات بۆ فێربوونی ڕەفتاری تازە و گرینگیدان بە هونەری پەیوەندیکردن.

٤- فەراهەمهێنانی کەشێکی گونجاو، کە ببێتە هۆی متمانەبەخۆبوون.

٥- هاوکاریی قوتابی دەکات بۆ هەستکردن بە هێمنی.

## ڕێنمایی دەروونی لە چ کاتێکدا پێویستە؟

ڕێنمایی دەروونی بابەتێکی پێویستە بۆ هەموو سەردەمێك، بەتایبەت لە سەردەمی ئێستا کە سەردەمی پێشکەوتن و تەکنەلۆژیایە، ڕێنمایی دەروونی دەبێتە خاڵێکی گرینگ بۆ ڕێکخستنی ژیانی مرۆڤ بە گشتی و قوتابی و مامۆستا بە تایبەتی.

هەرچەندە ڕێنمایی لەگەڵ سەرەتاکانی ژیانی مرۆڤ هەبووە، بەڵام لێرەدا ئاماژە بە کۆمەڵێك خاڵی گرینگ دەکەین کە پێویست بوونی پسپۆڕی دەروونی و ڕێنمایی پێویست دەکەن، ئەوانیش بریتین لە: گەورەبوونی خێزان، زۆربوونی جەنگ و ڕووداوە سروشتی و مرۆییەکان، زۆربوونی ژمارەی قوتابی، زۆربوونی ئاوات و ئامانجی مرۆڤ، چاودێری و سەرپەرشتیکردنی مرۆڤ (قەرەداغی، ٢٠٠٩: ٢- ٥)

### یەکەم: گەورەبوونی خێزان

بە گەڕانەوەیەکی خێرا بۆ ڕابردوویەکی نزیك دەبینین پێشتر خێزانەکان گەورە دەبوون و بەیەکەوە دەمانەوە، واتە دایك و باوك و منداڵەکان لە خانوویەکدا دەژیان، لەگەڵ ئەوەشدا دوای هاوسەرگیری هەر لە هەمان خانوودا دەمانەوە و خێزانیان پێك دەهێنا و منداڵەکان دەبوونە نەوەی باپیرە.

ئەم منداڵانە لە زۆربەی بوارەکانی ژیانیاندا دەگەڕانەوە بۆ باپیرە و



داپیرە، داوای ڕێنماییان لێ دەکردن بەو بیانووەی ئەوان خاوەنی ئەزموونن، بەڵام دوای گۆڕانکارییە خێراکانی ژیان و زاڵبوونی ستایلێکی تازە کە بریتییە لە جیابوونەوەی شوێن لە کاتی هاوسەرگیریدا، ئەمەش وا دەکات خێزانە تازە دروستبووەکە لە ڕێنمایی باپیرە و داپیرە بێبەش بن.

ئێمە باسی لایەنی ئەرێنی و نەرێنیی ئەو دوو حاڵەتە ناکەین، بێگومان هەردووکیان لایەنی باش و خراپی خۆیان هەیە، گرینگ ئەوەیە بزانین کە ئێمە مامەڵەمان لەگەڵ ئەم دوو شێوازەدا لە سەر بنەمای کات و وزە دەبێت، چونکە لەو کاتەدا ئەو شێوازە پێویست بوو، ئەمەش بەهایەکی گرینگی مرۆڤایەتیی تێدایە، لە شێوازی نوێشدا پێویستە هەمان بەها بمێنێتەوە ئەگەرچی شێوازەکەشی گۆڕاوە.

کەواتە بەهۆی پێویستبوونی کار و دوورکەوتنەوەی خێزانەکان لە شوێنی نیشتەجێبوونی دایك و باوکیان ڕێنمایی دەروونی بووەتە پێویستییەکی هەنووکەیی.

لە وڵاتاندا سەنتەر و بنکەی تایبەت بەم کارە دامەزراون و هاووڵاتییان ڕووی تێ دەکەن لەپێناو دەستخستنی ڕێنمایی.

بە شێوەیەکی گشتی ئەم خێزانانەی کە بێ سەرپەرشت و بێ باوك و دایك دەمێننەوە بێبەش دەبن لە ڕێنمایی وەرگرتن، دوای بێسەرپەرشتبوون، میدیا، یان کۆڵان ڕێنماییان دەکات، بێگومان لەو کاتەشدا پەروەردەی کەسەکان ناهاوسەنگ دەبێت و فێری چەندین ڕەفتار و ئاکاری نەخوازراو دەبن، لە ئاکامی فێربوونی ئەم ڕەفتارە نەخوازراوانە کۆمەڵگە تووشی دەیان گرفت دەبێت و دەبێتە هۆی دروستبوونی کێشە بۆ خۆی و خێزان و دەوروبەری.

## دووەم: زۆربوونی جەنگ و ڕووداوە سروشتی و مرۆییەکان

تا ئێستا جەنگ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەردەوامە، ئەمەش وێرانکاری و ئاسەواری خراپ لە سەر دەروونی مرۆڤ جێ دەهێڵێت، ئەم ئاسەوارە خراپە مرۆڤ تووشی دەیان گرفت و گرێی دەروونی دەکات.

ئەو کەسانەی بەشێوەی ڕاستەوخۆ لەنێو ئەو جەنگ و کاولکارییانەدا بوونە و هەڵاتوون، یان ئەوانەی بە ناڕاستەوخۆ ئاگاداری ئەم کاولکاری و جەنگانەن بەردەوام لە قەلەق و دڵەڕاوکێدا دەژین، بەردەوام ڕووداو و کاریگەرییە نەرێنی و خراپەکان لە یادگەیان دەمێنێتەوە و ئازاریان دەدات، ئەم ئازارە تووشی گرفتی دەروونییان دەکات.

## سێیەم: زۆربوونی ژمارەی قوتابی

زۆربوونی ژمارەی قوتابی بابەتی سەرەکیی ئێمەیە سەبارەت بە گرینگی و پێویستیی ڕێنمایی دەروونی، لە هەموو شتێك گرینگتر هەبوونی ڕێنماییە بۆ قوتابییان، بە تایبەت ئەگەر ژمارەی قوتابییان زۆر بێت، وەك دەبینین لە ئێستادا ساڵ لە دوای ساڵ ژمارەی قوتابییان زۆرتر دەبێت، لەگەڵ ئەمەشدا بەشێوەکی گشتی ئارەزوو و خولیای خوێندن کەم دەبێتەوە، هەوڵی لایەنەکانی پەیوەست بەم بوارە سستە و گرینگییەکی ئەوتۆی پێ نادرێت، ئەمەش وا دەکات قوتابی تووشی سەدەها گرفت بێت و نەتوانێت چارەسەری گەنجاویان بۆ بدۆزێتەوە.



بە شێوەیەکی گشتی ستانداردی جیهانی بۆ ژمارەی قوتابییان لە پۆلدا تەنها ٢٥ قوتابییە، ئەم ژمارەیە گونجاوە بۆ ئەوەی مامۆستا بتوانێت پەیام و مەبەستەکەی بگەیەنێتە قوتابی و لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ژمارەیە گونجاوە بۆ ئەوەی هەموو قوتابییان بتوانن بەشداریی گفتوگۆ بکەن.

ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین لە هەرێمی کوردستان زۆربەی قوتابخانەکان بە شێوەیەکی گشتی پڕن لە قوتابی و لە هەندێك پۆلدا ٥٠ قوتابی لە پۆلێك دەخوێنن، ئەمە بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ ستانداردی جیهانی ناگونجێت و هەندێك لە قوتابخانەکان زیاتر لە دەوامێکی تێدایە.

بەشێك لە مامۆستاکان بەپێی پسپۆڕی خۆیان وانەکان ناڵێنەوە، سەرباری ئەوەش نەبوونی هاوسەنگی لە نێوان (مامۆستا، قوتابی، پرۆگرام، بەڕێوەبەرایەتی)، هۆکارێکە بۆ ئەوەی قوتابی نەتوانێت بەتەواوی لە وانەکان تێبگات و فێریان ببێت، بێگومان نەبوونی ئەم هاوسەنگییە وای کردووە قوتابی نەخوێنێت و ڕێز لە مامۆستا نەگرێت، جگە لەمانەش وای لە قوتابی کردووە کە جورئەتی ئەوەی هەبێت هێرش بکاتە سەر مامۆستا و هەڵەی نەشیاوی بەرامبەر بکات.

پێویستە بزانین هەرچەندە پرۆگرام بگۆڕدرێت و ئاستی زانیاری و زانستیی قوتابی پێش بکەوێت، ئەگەر پەروەردە و ڕێنمایی دەروونیی لەگەڵ نەبێت، وەك ئەوە وایە هیچ گۆڕانکارییەك نەکرابێت، چونکە هەرچەندە مرۆڤ خاوەنی زانیاری بێت، بەڵام ڕەوشت و ئاکاری جوان نەبێت زەرەری بۆ کۆمەڵگە زیاترە لە کەسێك کە خوێندەواریی نەبێت.

## چوارەم: زۆربوونی ئاوات و ئامانجی مرۆڤ

سروشتی ئێستای ژیان مرۆڤی تووشی دڵەڕاوکێ و گرفت کردووە، بەشێوەیەك گرینگیدان بە بوارە لاوەکییەکانی مرۆڤ لە هەڵکشاندایە، مرۆڤ لە گرینگیدان بە شتە جەوهەریەکان لای داوە و خەریکی شتی لاوەکییە، مرۆڤ زیاتر لە ماددە و ڕووکەش نزیك بووەتەوە، ئەمەش هۆکارە بۆ دروستبوونی کێشە و گرفت، لە ئاکامیشدا قوربانیی لێ دەکەوێتەوە و مرۆڤ تووشی دەیان کێشە و گرفتی کۆمەڵایەتی و دەروونی دەکات.

شێوازی نوێی ژیان بریتییە لە لاساییکردنەوە و خۆ ماندووکردن بە شوێن کەمالیات و شتی لاوەکی و بێسوود، لە بەرامبەر ئەمانەشدا کارە گرینگەکان دەبنە قوربانی، ئەمەش وای لە مرۆڤ کردووە کە خولیا و ئاوات و ئارەزووی زۆر بێت، لەگەڵ زۆربوونی خولیا و ئارەزوودا مرۆڤ تووشی ململانێ دەبێت لەگەڵ خودی خۆی و وای لێ دێت نەتوانێت دەست بۆ هیچ شتێك ببات.

لێرە بۆمان دەردەکەوێت مرۆڤ پێویستی بە ڕێنمایی دەروونی هەیە، بۆ ئەوەی بەردەوام بەدوای شتی جەوهەری و سەرەکی بکەوێت، تا بتوانێت کاریگەریی لە سەر کۆمەڵگە هەبێت و ببێتە لایەنێکی گرینگ بۆ ئەوەی کۆمەڵگە بەرەو پێشەوە ببات.



## پێنجەم: چاودێری و سەرپەرشتیکردنی مرۆڤ

مرۆڤ جیا لە هەموو درووستکراوەکانی تری خودای گەورە بەردەوام پێویستی بە پەروەردە و ڕێنمایی دەروونی و سەرپەرشتیکردن هەیە تا ئەو ساتەی دەمرێت، واتە کاتێکی دیاریکراو لە ژیانی مرۆڤ نییە بۆ ئەوەی بڵێین پێگەیشتووە و پێویستی بە چاودێری و سەرپەشتیکردن نییە.

مرۆڤ لە هەموو قۆناغە جیاوازەکان پێویستی بە پەروەردەکردن هەیە، پەروەردەکردنیش قۆناغی جیاوازی هەیە، لە هەندێك قۆناغ تەنها چاودێریی کاروبارەکانی دەکرێت بۆ ئەوەی هەڵە نەکات، یان هەندێك کات چاودێری دەکرێت بۆ ئەوەی ڕاستییەکانی باشتر بکرێت و هەوڵی بەردەوامبوونی لەگەڵ بدرێت بۆ کاری باش.

## ڕێنمایی دەروونی بۆ؟

١- پسپۆڕی دەروونی لە ڕێگای پێشکەشکردنی ڕێنمایی هاوکاریی مرۆڤە ناساغەکان دەکات و هەوڵیان لەگەڵ دەدات بۆ ئەوەی لە ژیان بەردەوام بن و دان بەخۆیاندا بگرن، تا چارەسەر دەکرێن.

ئەگەر چارەسەری پێویستیش نەبوو، هەوڵیان لەگەڵ دەدرێت لەگەڵ ئەم قۆناغەدا خۆیان بگونجێنن و بەهەر شێوەیەك بێت لە ژیان بەردەوام بن و بتوانن وەك هەر کەسێکی ئاسایی چێژ لە ژیان و ئەو قۆناغە وەربگرن کە تیایدا دەژین.

٢- ڕێنمایی دەروونی هۆکارێکی گرینگە بۆ هێورکردنەوەی ئەو مرۆڤانەی کە زوو هەڵدەچن و کۆنترۆڵی خۆیان لەدەست دەدەن لە کاتی توڕەبووندا.

٣- ڕێنمایی دەروونی هاوکاریی مرۆڤ دەکات تا هەڵە و کەموکوڕییەکانی خۆیان بقۆزنەوە و لێیان فێر ببن، بۆ ئەوەی هەمان هەڵە دووبارە نەکەنەوە.



## ئامانجەکانی ڕێنمایی دەروونی

١- هاوکاریی قوتابی دەکات بۆ ئەوەی شارەزا و ئاشنا بێت بە وزە و تواناکانی، قوتابی هەرچەندە زیرەك و بەتوانا بێت، ئەگەر شارەزایی و لێهاتویی خۆی بەکار نەهێنێت، ناتوانێت ئامانجەکانی بپێکێت، چونکە ماندووبوونی قوتابی و مامۆستا بۆ ئەوەیە بتوانن ئامانجەکانی خۆیان بپێکن.

٢- هاوکاریی قوتابی دەکات بۆ ئەوەی بتوانێت بڕیار لە سەر هەڵبژاردنی ئەو پسپۆڕییە بدات کە لەگەڵ وزە و تواناکانی هاوتەریبە و توانای سەرکەوتن و داهێنانی تیایدا هەیە.

٣- هاوکاریی ئەو قوتابییانە دەکات کە تووشی شڵەژانی دەروونی و کۆمەڵایەتی بوونە، بۆ ئەوەی بتوانن هاوسەنگیی دەروونی و کۆمەڵایەتی فەراهەم بکەن و ببنەوە تاکێکی ئاسایی لە کۆمەڵگەدا.

٤- ڕێنمایی دەروونی هۆکارێکە وا دەکات بە ئاسانی کەسی پسپۆڕ قوتابیی بەهرەمەند و زیرەك بدۆزێتەوە.

٥- پسپۆڕی دەروونی لە ڕێگای ڕێنمایی دەروونی و چاودێریکردنی قوتابی دەتوانێت ئەو قوتابییانە دەستنیشان بکات کە بیرکۆڵن و لە خوێندن دواکەوتوون، بۆ ئەوەی گرینگیی زیاتریان پێ بدەن و بتوانن بیانهێننەوە ئاستی قوتابییانی ئاسایی و لە قوتابییەکانی هاوپۆلی خۆیان دانەبڕێن.

٦- ڕێنمایی دەروونی هۆکارێکی گرینگە بۆ پێشکەشکردنی زانیاریی تەواو سەبارەت بە خوێندنی ئایندە، جا ئەم زانیارییە پەروەردەیی، یان پیشەیی بێت.

## چی بکەین بۆ ئەوەی مامۆستایەکی باش بین؟

مامۆستای باش بە هەبوونی بڕوانامەی بەرز دەرناکەوێت، بەڵکو بەر لە هەموو شتێك پێویستە مامۆستا هەڵسوکەوت و ڕەوشتی بەرز بێت تا ببێت بە مامۆستایەکی باش.

قوتابی لە قۆناغی بنەڕەتیدا نازانێت مامۆستاکەی چ بڕوانامەیەکی هەیە؟ بگرە نازانێت بڕوانامە چییە؟ بەڵکو قوتابی تەنها هەڵسوکەوت و ئەتەکێتی مامۆستا دەبینێت، کەواتە چی بکەین بۆ ئەوەی مامۆستایەکی باش بین؟

### ١- منداڵانە بژی

واتە بۆ دەستخستنی مەبەستێکی دیاریکراو و زانیاریی تازە وەك منداڵ بە، بەردەوام بە لە سەر داواکردنی زانیاریی تازە، چونکە سروشتی منداڵ وایە ئەگەر پێویستی بەشتێك بوو تا بەدەستی نەهێنی واز ناهێنێت، پێویستە مامۆستا بەم شێوەیە بێت بۆ دەستخستنی زانیاریی تازە و سەردەمی، بەڵام بە مەرجێك داواکارییەکە گونجاو بێت و سوود بە قوتابی و قوتابخانە و زانست بگەیەنێت.



### ٢- لەگەڵ تازەدا بژی

بۆ بەردەوامبوون و نوێبونەوەی زانست و زانیاری پێویستە مامۆستا بەردەوام بە دوای بابەت و ڕێگای وانەگوتنەوەی سەردەمیدا بگەڕێت، گەڕان بەدوای زانست و باشترین ڕێگای وانەگوتنەوە هۆکارێکە بۆ ئەوەی مامۆستا ببێتە کەسێکی لێهاتوو و ناودار بۆ زانست و ئەکادیمی، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە مامۆستا بە دوای چەمك و زاراوەی نوێدا بگەڕێت بۆ ئاخاوتن و گفتوگۆکردن لەگەڵ قوتابییاندا.

### ٣- خاوەنی ڕاوبۆچوونی خۆت بە

پێویستە مامۆستا لە بابەتە جۆراوجۆرەکاندا خاوەنی ڕاوبۆچوونی خۆی بێت و نەبێتە پاشکۆی بیروبۆچوونی ئەوانی تر.

گرینگ نییە ئەوەی دەیڵێیت هاوتایە، یان پێچەوانەیە، لەگەڵ بیروبۆچوونی ئەوانی تر، بەڵکو گرینگ ئەوەیە خاوەنی بیر و بیرکردنەوەی خۆت بیت و پارێزگاری لە سەربەخۆیی خۆت بکەیت، چونکە ئەمە تاکە هۆکارە بۆ ئەوەی مامۆستا وا لە قوتابییەکانی بکات متمانەی پێ بکەن و شوێنکەوتەی ئەو بن و بەردەوام خەریکی بیرکردنەوە و گفتوگۆی ئەکادیمی بن تا ببنە نەوەیەکی پێشەنگ بۆ کۆمەڵگە.

## ٤- بەرپرس بە

پێویستە مامۆستا بەردەوام هەستی بەرپرسیاریەتی لە ناخی بێت، بۆ ئەوەی بتوانێت ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی هەموو ئەرك و ئاستەنگێك ببێتەوە، هەستی بەرپرسیاریەتی وا لە مامۆستا دەکات شانازی بە کەسایەتیی خۆی بکات، لەگەل ئەوەشدا پێویستە مامۆستا بەرپرس بێت لە هەموو ئەم شتانەی کە ڕووبەڕووی دەبنەوە.

## ٥- بەجدی کار بکە

پێویستە مامۆستا ببێت بە ڕاهێنەر، باوك و دایك بۆ قوتابییەکانی، دەبێت مامۆستا شان بداتە بەر ئالۆزی و ناخۆشییەکان، پێویستە لە پەروەردە و فێرکردن بەردەوام بێت.

دەبێت مامۆستا هەستی بەرپرسیاریەتی لە ناخی قوتابییەکانی بچێنێت، مامۆستا پێشەنگ و ڕێبەرە بۆ قوتابییەکانی، ئەگەر خۆی هەستی بەرپرسیاریەتیی نەبێت، چۆن قوتابییەکان ئەو هەستەیان لا دروست دەبێت.



## ٦- کەموکورپیەکانت بدۆزەوە

هیچ مرۆڤێك لە کەموکورتی بەدەر نییە، مامۆستا مرۆڤە وەك هەموو مرۆڤێکی تر، نابێت مامۆستا لەبەر ئەوەی مامۆستایە، یان لەبەر ئەوەی ئەرکی بەرپرسیاریەتی و پەروەردە و فێرکردنی لە ئەستۆدایە، هەستی خۆ بەگەورەزانینی لا دروست بێت و ببێت بە خاوەن بڕیار.

مامۆستا دەبێت بەردەوام بەدواداچوونی ڕاستگۆیانە بۆ خۆی و بڕیارەکانی بکات، هەوڵی ئەوە بدات خاڵە لاوازەکانی کەسایەتیی خۆی بدۆزێتەوە.

بەم هەنگاوە مامۆستا دەتوانێت بەرگری لە خۆی و کەموکوڕییەکانی بکات و لە کاتی بڕیاردانی نادروست لێپرسینەوە لەگەل خودی خۆی بکات.

## بنەماکانی ڕێنمایی دەروونی

هەموو چەمکێك لە سەر چەندین بنەمایەک بینا دەکرێت، هیچ شتێك نییە لە ژیاندا بنەمای نەبێت، بنەما بۆ هەموو شتێك پێویستە، ژیانی مرۆڤ بنەمای هەیە، خێزان بنەمای هەیە، باوکایەتی و دایکایەتی بنەمایان هەیە، بەرپرسیاریەتی و مامۆستایەتی بنەمای هەیە، بوون بە قوتابی بنەمای هەیە، کەواتە هیچ شتێك نییە بنەمای نەبێت.

بەهەمان شێوە ڕێنمایی دەروونیش چەندین بنەمای هەیە، بە شێوەیەکی گشتی بنەماکانی ڕێنمایی دەروونی سەرەتا لە ڕێنمایی تاکەوە دەست پێدەکات، بە جۆرێك ئەم ڕێنماییانە لەگەڵ بەها و کلتوور و ئاینی مرۆڤ دژ نەوەستن، مرۆڤ و تاك ئازادن لە هەوڵدا بن بۆ ئەوەی ئامانجەکانیان بهێننە دی و فێر ببن، لە خوارەوە بە وردی باس لە بنەماکانی ڕێنمایی دەروونی دەکەین (قەرەداغی، ٢٠٠٩: ٨- ٩)).

١- ڕێزگرتن لە جیاوازیی تاکایەتیی قوتابییان، خودای گەورە بە شێوەیەك مرۆڤی دروست کردووە کە جیاواز بێت لە مرۆڤێکی تر، بۆیە پێویستە مامۆستا ڕێز لە قوتابی و ئاین و خانەوادەکەی بگرێت.

ڕێزگرتن بەشێکی گرینگە لە ژیانی قوتابی بۆ ئەوەی لە ئاسایش و ئارامیدا بێت، بەم شێوەیە قوتابی ڕێز و خۆشەویستیی بۆ مامۆستاکەی دەبێت و خۆشی دەوێت، لەگەڵ ئەوەشدا وانەکەی خۆش دەوێت و هەوڵی فێربوون و خوێندن دەدات.



٢- ڕەچاوکردنی قۆناغەکانی ژیانی قوتابی و گاڵتەنەکردن بە قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیان، وەك دەزانین لە هەندێك قۆناغ گۆڕانکاری بەسەر ڕوخسار و دەنگ و شێوەی ئاخاوتنی مرۆڤدا دێت، لەم قۆناغەدا قوتابی زۆر هەستیارە نابێت گاڵتەی پێ بکرێت.

بەڵکو دەبێت ڕێنمایی تەواو و دروستی ئاڕاستە بکرێت بۆ ئەوەی بە شتێکی ئاسایی وەری بگرێت و بتوانێت خۆی لەگەڵ هەموو قۆناغەکان بگونجێنێت.

٣- پێویستە مامۆستا ڕەچاوی گەشەی تاك بکات لە هەموو ڕەهەندەکانییەوە، مرۆڤ بەردەوام لە گۆڕان و گەشەدایە، بەتایبەت لە لایەنی عەقڵی و کۆمەڵایەتی و جەستەیی و سۆزداری، ئەگەر لە کاتی گەشە و گۆڕانکاریدا مامۆستا نەتوانێت بە شێوەیەکی دروست مامەڵە لەگەڵ قوتابی بکات، ئەوا قوتابی تووشی گرفتی دەروونی دەبێت و ئارەزووی خوێندن و قوتابخانەی نامێنێت، بۆیە پێویستە مامۆستا شارەزاییەکی باشی لە لایەنی سایکۆلۆژیی مرۆڤ هەبێت بۆ ئەوەی تووشی هەڵەی وا نەبێت کە ببێتە هۆی تۆرانی قوتابی لە خوێندن و قوتابخانە.

٤- دەبێت مامۆستا ڕەچاوی تێرکردنی پێداویستییەکانی قوتابی بکات، چونکە هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤ جۆرێك لە پێویستیی هەیە، ئەگەر ئەم پێداویستییە لەم قۆناغەی کە پێویستە بۆ قوتابی دابین نەکرێت، ئەوا کاردانەوەی نەرێنی لە سەر کەسایەتی جێ دەهێڵێت، بە جۆرێك ئەگەر گەورەش بێت هەوڵی بەدەستهێنانی ئەم پێداویستییە دەدات.

بۆیە دەبێت مامۆستا و سەرپەرشتیار و دایك و باوكان هەوڵی ئەوە بدەن لە هەر قۆناغێك بە پێی توانا پێداویستییەكانی قوتابییان و منداڵەكانیان جێبەجێ بكەن، چونكە ئەگەر تێركردنی پێداویستییە پەروەردەییەكان لە قۆناغی دیاریكراو بە تەمەنی خۆی بێت ئەوا نابێتە خەوش و كەموكوڕی، بەڵام ئەگەر لە قۆناغێكی تر بێت ڕەنگە بەدەستهێنان و هەڵدان بۆ تێركردنی ئەم پێداویستییە ببێت بەخەوش لە سەر كەسایەتی مرۆڤ.

٥- ڕێنمایی دەروونی هۆكارێكی یارمەتیدەر و سەرەكیی مامۆستایە بۆ ئەوەی بتوانێت گەشە بە پرۆگرام و وانەكان بدات.

لەگەڵ ئەوەشدا مامۆستا دەتوانێت لە ڕێگای ڕێنمایی دەروونی خۆی لەگەڵ هەموو پێشهات و ڕووداوە نەخوازراوەكان بگونجێنێت و بە شێوەیەكی دروست و پەروەردەیی مامەڵەیان لەگەڵ بكات و گونجاوترین چارەسەریان بۆ بدۆزێتەوە.

كەواتە ڕێنمایی دەروونی پرۆسەیەكی كاریگەرە بۆ مامۆستا و قوتابی و پرۆگرام، ئەمەش بە تەواوكەری پرۆسەی پەروەردە و فێركردن دادەنرێت.

٦- ڕێنمایی دەروونی بنەمایەكی گرینگە بۆ پتەوكردنی پەیوەندیی نێوان پسپۆڕی دەروونی و مامۆستایان و كەسوكاری قوتابییان، ئەم پەیوەندیەش كارێكی گرینگە بۆ سەرخستن و پتەوكردنی پرۆسەی پەروەردە و فێركردن.

٧- پێویستە ڕێنمایی دەروونی و پەروەردەیی لە ناوەندی قوتابخانە و پۆلەكان قۆرخ نەكرێت و هەوڵی ئەوە بدرێت ئەم ڕینماییانە بۆ كۆڵان و شەقامەكان بگوازرێنەوە ، ئەم هەنگاوە بۆ ئەوەیە كە خەڵكی ئاسایی و كاسب بتوانن سوود لە ڕێنمایی و ئامۆژگارییەكانی پسپۆڕی دەروونی وەربگرن.

٨- یەكێك لە بنەما گرینگەكانی ڕێنمایی دەروونی و پەروەردەیی بریتییە لە تەبایی و گیانی هاوكاری، پسپۆڕی دەروونی و پەروەردەیی بەردەوام ڕێنمایی مامۆستایان دەكەن كە پێویستە مرۆڤ بە كەموكوڕییەكانیانەوە قەبوڵ بكرێن و وەك مرۆڤ سەیری یەكتر بكەین و ڕێز لە هەموو پیرۆزییەكانی یەكتر بگرین.

٩- دەبێت مامۆستا و قوتابی بە یەكەوە هەوڵی پاراستنی نهێنیەكانی پرۆسەی پەروەردە و قوتابخانە بدەن، ئەگەر كێشەیەك دروست بوو بە یەكەوە هەوڵی چارەسەركردن و بنەبڕكردنی بدەن، بە هەموو شێوەیەك هەوڵ بدەن ئەم كێشەیە نەچێتە دەرەوەی قوتابخانە و خەڵكی تر پێی نەزانێت، تا دەكرێت هەوڵی بچووككردنەوە و چارەسەركردنی كێشەكان بدەن لە ژێر ڕێنمایی پسپۆڕ و سەرپەرشتیاری دەروونیدا.

# بەشی چوارەم

## جۆرەکانی رێنووس لە بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتیدا

چەمکی رێنووس

بایەخی رێنووس

بابەخی رێنووس بۆ کۆمەڵە ئەرکێك دەگەرێتەوە

ئامانجەکانی گوتنەوەی رێنووس

ئەو یادگانەی لە وانەی لە رێنووس بەکار دێن

جۆرەکانی رێنووس

رێنووسی گواستراو

رێگاکانی گوتنەوەی رێنووسی گواستراو

لە رێنووسی گواستراو پێویستە رەچاوی ئەم خاڵانە بکرێت

رێنووسی بینراو

هەنگاوەکانی گوتنەوەی رێنووسی بینراو

رێنووس بە گوێگرتن

هەنگاوەکانی گوتنەوەی رێنووس بە گوێگرتن

گرینگیی رێنووس بە گوێگرتن

کۆمەڵێك نموونەی جیاواز بۆ دەستنیشانکردنی سستی لە رێنووسدا

نموونەی یەکەم/ تا ئێستاش لە کاتی نووسیندا هەڵە دەکەم

نموونەی دووەم/ لەبەر چی وازم لە خوێندن هێنا

نموونەی سییەم/ دەق و وێنەکان بۆ قوتابی شی بکەنەوە

نموونەی چوارەم/ رێنووس چی بوو؟

سەرنج

## چەمکی ڕێنووس

ڕێنووس بریتییە لە یاسا و ڕێسا و چۆنیەتی نووسینی وشە و فرمانی زمانێك لە دۆخی جۆربەجۆردا، ڕەچاونەکردنی ڕێنووس دەبێتە هۆی ئەوەی وشەکان هەڵە بخوێندرێتەوە.

ڕێنووس لە دوو وشەی (orthos- ڕاست) و (graphy- دەنووسم) ەوە پەیدا بووە، کە لە کوردیدا واتەی ڕاستنووسی، یان دروستنووسی دێت، کە بە یەکەوە بە مانای (orthography)، دێت (حاجی مارف، ٢٠١٤: ١٧٠).

ڕێنووس بۆ ڕاهێنانی قوتابییە لە سەر ڕاست و دروست نووسینی وشەکان و گەشەپێدانی هەندێك ڕەوشت و چاپووکیی وەك گوێگرتن، هۆشیاری، تیژبینی، لەگەڵ ئەوەشدا سامانی وشەی دەوڵەمەند دەکات و شارەزایی و ڕۆشنبیریی بەهێز دەبێت (ابومغلی، ٢٠١٥: ٦٩،٦٨).

ڕێنووس لقێکە لە لقەکانی زمان و زمانی کوردی، بە بنەمایەکی گرینگی دەربڕینی نووسین دادەنرێت، ئەگەر ڕێزمان و وشەسازی هۆکار بن بۆ دروستنووسی و نووسین لە لایەنی شیکردنەوە و وەرگرتنی وشە لە بنچینەکانییەوە، ئەوا ڕێنووسیش هۆکارێکی تری دروستیی نووسینە.

ئەگەر ڕێزمان هۆکاری هەڵسەنگاندنی قەڵەم و زمان بێت لە دروستیی نووسیندا، ئەوا ڕێساکانی نووسینییش هۆکارن بۆ هەڵسەنگاندنی قەڵەم و درووستیی نووسین، پەیوەندییەکی پتەو لە نێوان دروستنووسی و



تێگەیشتنی دەقی نووسراودا هەیە، بۆ ئەوەی خوێنەر لە نووسین تێ بگات پێویست دەکات نووسینەکە دروست و ڕاست و لە هەڵە و کەموکورتی پاکژ بێت.

نووسینی ڕاست و دروست پێوسیتی بە مەشق و ڕاهێنانی بەردەوام هەیە، هاوڕێ لەگەڵ هۆشیاربوون لە چۆنیەتی نووسینەکەی و تێبینیکردنی پیتەکان بە وردی و بەکارهێنانی پتر لە هەستێك لە فێرکردنی ڕێنووسدا بۆ ئەوەی وێنەی وشەکان لە زەیندا بچەسپێت و ببێتە کارامەیی لای قوتابی.

ڕێنووس کردەی گۆڕینی دەنگە بیستراو و ڕوونەکانە بۆ هێمای پیتەکان، بە مەرجێك ئەم پیتانە هەر یەکێکیان لە جێگەی دروستی خۆیان لە ناو وشەدا دابنرێن (بنووسرێن) بۆ ئەوەی گۆکردن و دەرکەوتنیان واتەی مەبەست بەدەستەوە بدەن.

ڕێنووس لە خۆیدا ئەو پێوەرە وردەیە لە ئاستی قوتابییانی تەمەن منداڵ لە پرۆسەی فێربوونیاندا پێی گەیشتوون، هەروەها ڕەنگە بە سیستەمێکی زمانی پێناسە بکرێت و بە وردی کاری لە سەر بکرێت لە کاتی جێبەجێکردندا (خۆشناو، ٢٠١٤: ١٢٥).

## بایەخی ڕێنووس

قوتابی لە یەك کاتژمێری وانەیەکی ڕێنووسدا هێزی ئەوە بەدەست ناهێنێت توانای بە سەر ڕێنووسێکی ڕاست و دروستدا بشکێت، بەڵکو بە ئاخاوتنی بەردەوام، گفتوگۆکردن، گوێڕادێران و خوێندنەوە ئەم توانایە بەدەست دێت، بۆیە پێویستە لە نێوان وانەکانی بەرنامەی ڕێنووس و مەشقەکانی بەدەستهێنانی کارامەییەکانی زمان ڕێککەوتنێك هەبێت پێش ئەوەی دەست بکرێت بە گواستنەوە بۆ ناو کارامەییەکانی نووسین.

قوتابی لەسەریەتی کارامەییەکان فێر ببێت، چونکە بە درککردنی وشە و تێگەیشتنی واتە و جوداکردنەوەی دەنگی پیتەکان و حونجەکردنیان لەگەڵ ناسینی بەشەکانی ئەم کارامەییانە، قوتابی دەگاتە ئەوەی لە واتە تێبگات و دەنگەکان لە یەکتر جیا بکاتەوە و حونجەیان بکات، لەگەڵ ئەوەشدا ڕەگەزەکانی بناسێت.

هەر کاتێك قوتابی نەتوانێت ئەو پەیوەندییانە لە یەکتر جودا بکاتەوە کە لە نێوان وشە سەرەکی و بیستراوەکاندا هەیە، یان نەتوانێت لە کاتی خوێندنەوەدا بە شێوەیەکی ڕێکوپێك چاوی لە سەر وشەکان بگوازێتەوە، ئیدی قوتابی پیتە لێکچووەکان تێکەڵ دەکات، کەم یان زۆریان دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا لە سەر هەندێکیان هەڵدەبوێرێت )عاشور، ٢٠١٤: ١٣١).



## بایەخی ڕێنووس بۆ کۆمەڵە ئەرکێك دەگەڕێتەوە

١- قوتابی لە سەر وردبینی ڕادەهێنێت.

٢- قوتابی لە سەر گوێگرتن و هۆشیاربوون ڕادەهێنێت.

٣- قوتابی لە سەر پاك و خاوێنی و خۆڕێککردن ڕادەهێنێت.

٤- سامانی فەرهەنگی زمانی لە میانەی دانە زمانییە جۆراوجۆرەکان دەوڵەمەند دەکات.

## ئامانجەکانی گوتنەوەی ڕێنووس

١- قوتابی لە سەر وێنەکێشانی پیتەکان بە دروستی ڕادەهێنێت.

٢- وێنەکێشان (نووسین)ی، وشەکان بە خەتێکی خوێندراوە کە هەموو پیت و شێوە و جوولەکانیان دەگرێتەوە، لەگەڵ دانانی خاڵ لە شوێنی خۆیدا.

٣- ڕێنووس هۆکارێکە بۆ گەشەپێدانی تێژبینی و هۆشیاری لەگەڵ ڕاهێنانی قوتابییان لە سەر پاك و خاوێنی و ڕیزبەندی و ڕوونی، کە چێژی جوانیناسی لای قوتابی گەشە پێدەدات.

٤- پێویستە ڕێنووس لایەنێك لە ئەرکی بنەڕەتیی زمان بەدی بهێنێت کە مەبەست لێی تێگەیشتن و تێگەیاندنە لەو پارچە نووسینە (ڕێنووسە).

٥- مەشقکردن بە قوتابییان لە سەر بەکارهێنانی نیشانەکانی خاڵبەندی بە شێوەیەکی دروست و ڕەوان.

٦- گەشەپێدانی کارامەیی نووسین لای قوتابییان و ڕاهێنان لە سەر خێرایی نووسیندا.

٧- گەشەپێدانی وردیی تێبینی و هۆشیاری و بە ئاگایی لەگەڵ ڕاهێنانی هەردوو هەستی بیستن (گوێ) و بینین (چاو)، بە جۆرێك کە یارمەتییان بدات برگەی وشەکان لەگەل پیت و شێوەکانیاندا بە جووڵەکانیانەوە جودا بکەنەوە، لەگەل ڕاهێنانی دەست و پەنجە و ماسولکەکانیان لە جووڵاندنێکی ورد و ڕێکدا.

٨- گەشەپێدانی سامانی زمانی و فەرهەنگی زمانیی قوتابییان لەگەڵ فراوانکردنی شارەزاییەکانیان و جۆراوجۆر کردنیان.

٩- پێوانەکردنی توانای قوتابییان لە سەر نووسینی ڕاست و دروست و مەودای پێشکەوتنیان، هەروەها زانینی ئاستی ڕێنووسی قوتابییان بۆ پەیڕەوکردنی هۆکار و چارەسەرە لەبارەکان.



## ئەو یادگانەی لە وانەی ڕێنووس بەکار دێن

### ١- یادگەی بیستن (گوێ)

بۆ گەنجینەکردن و چەسپاندنی بێژەی وشە، پێویستە مامۆستا وشەکان بە شێوەیەکی دروست و ڕەوان گۆ بکات و دەربڕینیان هیچ جۆرە خەوشێکی تێدا نەبێت و دووبارەکردنەوەشی لەگەڵدا بێت، ئەمەش بۆ ئەوەیە لە زەینی قوتابییان بچەسپێت.

پێویستە لەبەر چاو و گوێی قوتابی وشە بە هەڵە گۆ نەکرێت، چونکە نابێت لە کاتی گۆکردنی دەقدا وشە بە هەڵە بگاتە گوێی گوێگر، بەڵکو دەبێت بە دروستی گۆ بکرێن بۆ ئەوەی شێوەکەی لەگەڵ گۆکردنەکەی بێتە بەرچاوی قوتابی (ئەوەی دەینووسێت).

دەبێت مامۆستا ئاگادار بێت وشە لێکچوو و نزیکەکان بە قوتابی نەدرێت، چونکە قوتابی لە کاتی ڕێنووسدا تێکەڵیان دەکات.

### ٢- یادگەی دیدە- دیتن (چاو)

ئەگەر ئەو وشەیەی کە بۆ قوتابی دانراوە تا بینووسێت (ڕێنووسی لە سەر بکات) شێوەکەی بە نووسین پیشانی قوتابی بدرێت پتر هاوکاریی بینین و هاتنە پێش چاوی وێنەکە دەدات و قوتابییەکانیش بە دروستی وشەکە دەنووسن؛ چونکە لە یادگەی دیتندا وێنەکەی پێشتر گەنجینە کردووە و لە کاتی نووسین و ڕێنووس ئەرکێکی گران نابێت.

لەگەڵ کردەی نووسیندا (ڕێنووس) وشەکە بە نووسراوی پیشان بدرێت، کارئاسانییە بۆ باشتر چەسپاندن و لەبیرنەچوونەوەی وێنەی پیت، یان وشەکە.

هەورەها بەکارهێنانی تابلۆ، یان کارتۆن و تەختە بۆ پێشاندانی ئەو وشەیەی کە مەبەستیەتی کردە و چالاکیی نووسینی بۆ بکرێت، کارێکی زانستییانە و هونەرییە و نووسین لای قوتابی خۆشەویستتر دەکات و چالاك و دروستتر فێری نووسین دەبێت، بە تایبەت لە وشە و پیتە لێك نزیکەکان لە شێوە و دەنگدا، نابێت وشەکان بە هەڵە نووسرابن، چونکە ڕاستکردنەوەی وشە گران و ئاڵۆزە بۆ قوتابی.

### ٣- یادگەی بێژەیی

مەبەست لە بێژە گۆکردنی وشە و دەستەواژە و ڕستەکانە بە دروستی و بە دەنگێکی ڕوون و ڕەوان و بێ هەڵەکردن لە دەرچەی پیتەکاندا.

پێویستە مامۆستا بە یەك دەست و دەنگ چەند جارێك بۆیان دووبارە بکاتەوە و گوێیان بکات.

نابێت مامۆستا کەمتەرخەم بێت و هەڵە بکات، چونکە ڕاستکردنەوە لە خوێندنەوەدا شتێکی هەڵەیە و قوتابی تووشی سەرلێشێوان دەکات، کەواتە دەبێت واتە و دەربڕینەکان لە خوێندنەوەدا بە باشی و جوانی ئەنجام بدرێت.



### ٤-یادگەی ماسولکەیی

مەبەست ئەو ماسولکە و جومگانەیە کە نووسین و خوێندنەوەی دروستیان پێ ئەنجام دەدرێت، بۆیە دەست و پەنجە و پەل بە پلەی یەکەم دێن، ئەمانەش ڕاهێنانیان پێویستە و نابێت هێندە نووسین و ڕێنووس بە قوتابی بکرێت کە ببێتە هۆی بێزاربوون و ڕقی لە نووسین و تووشی خەتناخۆشی ببێت، چونکە بێزار بوون لە نووسین وا لە قوتابی دەکات تەنها نووسین و ڕێنووسەکە لەکۆڵ خۆی بکاتەوە.

کەواتە پێویستە مامۆستا لە سنووری چالاکیی خۆش و ئاسان و چێژبەخشدا بسووڕێتەوە، نەك وشەکان درێژ و گران بن قوتابی نەزانێت بینووسێت، بە تایبەت لە پۆلی یەکەم و دووەم و سێیەمدا.

پێویستە مامۆستا بزانێت، پرۆڤەکردن لە سەر نووسینی دروست بەر لەوەی بخرێتە قاڵبی تاقیکردنەوە یاریدەدەرە بۆ ئەوەی قوتابی بە سنگفراوانی و دڵخۆشییەوە ڕوو لە ڕێنووس بکات.

مامۆستای سەرکەوتوو ئەو کەسەیە کە ئەم چوار یادگەیە لە ڕێنووسدا بەشداری پێ بکات و دەقی نائاشنا و گران و ئاڵۆز نەکات بە نموونە بۆ چالاکیی ڕێنووس.

دەبێت لە هەر قۆناغێکیشدا تەمەن لەبەر چاو بگیرێت و قوتابی نەکرێت بە تاقیگە و کێبڕکێی گران کە نووسینی پێ نەکرێت، قوتابی لە هەر قۆناغێك بێت تواناکانی ژیری، ماسولکەیی، دیتن و بیستنی جیاواز و سنووردارە، منداڵیش دەچێتە قوتابخانە فێر بکرێت، نەك تاقی بکرێتەوە (عاشور، ٢٠١٤: ١٢٩)

## جۆرەکانی ڕێنووس

دوای شیکردنەوە و وردبوونەوە لە زاراوەی ڕێنووس، هەوڵ دەدەین لەم بەشەی توێژینەوە جۆرەکانی ڕێنووس بە وردی بخەینە ڕوو و باسی ئەوە بکەین کام جۆر ڕێنووس بۆ کام قۆناغ و پۆل گونجاو و دروستە.

### یەکەم - ڕێنووسی گواستراو

ئەم جۆرەی ڕێنووس لە کتێب، یان لە سەر کارت بۆ ناو دەفتەر و سەرتەختە دەگوازرێتەوە، دوای خوێندنەوەی بابەتەکە و هاوڕێ لەگەڵ تێگەیشتنی ئەم بابەتەدا، هەندێك لە وشەکان بە زارەکی حونجە و بڕگە دەکرێت.

ئەم جۆرەی ڕێنووس بۆ پۆلی دووەم و سێیەمی بنەڕەتی لەبار و گونجاوە، هەندێك کات لە پۆلی چوارەمیشدا بەکار دێت (ابومغلی، ٢٠١٥: ٦٩-٧٠).

مەبەست لەم جۆرەی ڕێنووس گواستنەوەی پارچە نووسراوەکەیە لە کتێبی قوتابی، یان لە سەر تەختە و کارتێکی گەورە، کە (وشە و ڕستە) و مەبەستەکانی لە سەر نووسراوە، ئەمەش دوای خوێندنەوەی نووسینەکە، هاوڕێ لەگەڵ تێگەیشتنی واتەکەی دێت.



لەگەڵ ئەوەشدا بە چاو ڕاهێنان لە سەر سەیرکردن و خوێندنەوەی دەکرێت بۆ ناسینەوەی هەندێ لە دانەکان و حونجەکردنیان، مامۆستا پارچە نووسراوەکە بەش بەش دەخوێنێتەوە، قوتابییەکانیش پێبەپێی ئەو سەیری ئەو وشە و دەستەواژە نووسراوانە دەکەن کە مامۆستا دەیانخوێنێتەوە، پاشان دەینووسن، ئەم جۆرەی ڕێنووس بۆ پۆلی سێیەم و چوارەمی بنەڕەتی گونجاو و لەبارە.

### هەنگاوەکانی گوتنەوەی ڕێنووسی گواستراو

١- دەستپێکێك لە سەر بابەتەکە بە قوتابییان دەدرێت، هەروەك ئەو دەستپێکەی لە وانەی موتاڵەعە (مطالعە)دا دەکرێت، کە چەند نموونەیەك، یان وێنەگەلێك پیشان دەدرێن، هاوکات چەند پرسیارێکیش لە سەر بابەتەکە بە گوێی قوتابییاندا دەدرێت، بۆ ڕێگا خۆشکردن و گوتنەوەی ڕێنووس.

٢- بابەتەکە لە سەر کتێب، یان لە سەر کارت، یاخود بە نووسراوی لە سەر تەختەکە (گەر داتاشۆ هەبوو باشترە) پیشان دەدرێت، بێ ئەوەی وشەکان جووڵەکانیان لە سەر دابندرێت، ئەمە بۆ ئەوە پێویستە نەوەك قوتابییەکان لەبەریان ڕێنووس بکەن و دواتر تووشی هەندێك هەڵە ببن، چونکە ئەم هەموو ئەرکەیان لە سەر کەڵەکە ببێت شپرزە دەبن.

٣- مامۆستاکە پارچەی ئامادەکراو بۆ ڕێنووسکردن بە شێوەیەکی پوخت و

ڕەوان دەخوێنێتەوە.

٤- چەند قوتابییەك تاك تاك پارچە نووسینەکە دەخوێننەوە، بێ ئەوەی لەلایەن قوتابییانی گوێگرەوە بابەتەکەیان پێ ببڕدرێت بە مەبەستی هەڵە چاککردنەوە.

٥- مامۆستا چەند پرسیارێك لەبارەی دەقەکە ئاڕاستەی قوتابییان دەکات بۆ دڵنیابوون لە تێگەیشتنی قوتابییان لە سەر بیرۆکەکانی نێو دەقەکە، ئەم هەنگاوە مەشقێکە بۆ دەربڕینی زارەکی، کە پێویستە لە هەموو وانە و بابەتێکدا بەشی خۆی هەبێت.

٦- حونجەکردنی وشە گرانەکانی نێو دەقەکە بۆ دڵنیابوون لە تێگەیشتن و ناسینەوە و تێکەڵنەکردنیان لەگەڵ هاوشێوەکانیان، چاکترە ئەو وشانە بەکێشانی هێڵێك بە ژێریاندا نیشانە بکرێن، یان بە نووسینیان بە ڕەنگێکی تر و جیاواز، ئەمەش لە کاتی بەکارهێنانی تەختەی دووەم، شێوازی حونجەکردنی وشەکانیش بە ئاماژەکردنی مامۆستا دەبێت، کە ئەویش بە داری ئاماژە دەبێت بۆ وشەی مەبەست )عاشور، ٢٠١٤: ١٣٣-١٣٤).

**لە ڕێنووسی گواستراودا پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکرێت**

١- دانانی دەفتەری ڕێنووس و کەرستەکانی نووسین، تۆمارکردنی مێژوو و ڕۆژ و ژمارەی بابەتی ڕێنووس.

٢- مامۆستا دەقەکە وشە بە وشە بۆ قوتابییان دەخوێنێتەوە و لە کاتی



بەکارهێنانی تەختەی دووەمدا ئاماژە بۆ وشەکان دەکات.

٣- هەموو قوتابییەکان یەك دەست، لە یەك کاتدا پێکەوە دەنووسن، پێویستە مامۆستا ڕێگای ئەو قوتابییانە نەدات کە دەیانەوێت خۆیان دەربخەن کە گوایە زووتر لێ بوونەتەوە و پێشبڕکێ دروست دەکەن.

٤- کۆکردنەوەی دەفتەرەکانی ڕێنووس، پێویستە ڕێکوپێك و هێمنانە بێت، نەبێتە پچڕ پچڕ و پەلکردن.

٥- ئەوکاتەی لە وانەکە ماوەتەوە و ڕێنووسەکە تەواو بووە، پێویستە مامۆستا لە کارێکی بەکەڵك بەکاری بهێنێت، وەك باشترکردنی خەت و چاککردنی هەڵەکانی نووسینی هەندێك لە پیت و وشەکان، یاخود گفتوگۆکردن لە سەر ناوەڕۆك و مەبەستی دەقەکە (عاشور، ٢٠١٤: ١٣٤).

**دووەم/ ڕێنووسی بینراو**

لەم جۆرەی ڕێنووسدا مامۆستا پارچەی دیاریکراو بۆ مەبەستی ڕێنووس لە پۆل پیشانی قوتابییان دەدات و بۆیان دەخوێنێتەوە تا تێبگەن و ئاشنایی لەگەڵ پەیدا بکەن، هەروەها هەندێك لە وشەکان حونجە و برگە دەکات، پاشان ئەو پارچە دیاریکراوەی بۆ ڕێنووس ئامادە کراوە لە پێش چاویان لادەبرێت بۆ ئەوەی بۆیان بخوێنێتەوە و بینووسنەوە، ئەم جۆرە ڕێنووسە بۆ پۆلی سێی بنەڕەتی گونجاوە. (ابومغلی، ٢٠١٥: ٧٠).

لەم جۆرەی ڕێنووسدا پارچە ئامادەکراوەکە بۆ مەشقکردن و ڕێنووس پیشانی قوتابییان دەدرێت تا بیخوێننەوە و لێی تێبگەن، لەگەڵ ئەوەشدا مەشق لە سەر نووسینی شێوەی وشەکان دەکەن، پاشان پارچە نووسینەکە لەبەر چاویان لادەبرێت دواتر بۆیان دەخوێندرێتەوە، بۆ ئەوەی بەپێی دەقەکە ئەو وشە و ڕستانەی گوێبیستی دەبن بیاننوسێتەوە.

لەم جۆرەی ڕێنووسدا گەلێك هەوڵدان و پرۆڤەی پەروەردەیی هەن بۆ چەسپاندنی وێنەی وشەکان لە زەینی قوتابییاندا.

هەندێك کات مامۆستا دەتوانێت ئەم جۆرەی ڕێنووس لە پۆلی چوار و پێنجی بنەڕەتی بەکار بهێنێت، بەتایبەت کاتێك بزانێت قوتابییەکان پێویستیان پێیەتی و ئەمەش دەبێت لە کاتی زیادەی وانەی ئەو پۆلە بێت، نەك لە سەر مافی وانەکانی پۆل بێت، واتە دەبێت مامۆستا لەو کاتە بەکاری بهێنێت، کە کاتی زیادەی وانەکەیە (عاشور، ٢٠١٤: ١٣٤).

## هەنگاوەکانی گوتنەوەی ڕێنووسی بینراو

١- مامۆستا دەقەکە بە ڕوونی بۆ قوتابییەکان دەخوێنێتەوە، دواتر بەیەکەوە گفتوگۆی لە سەر دەکەن و لە واتە و ناوەڕۆکەکەی دەکۆڵنەوە، دواتر وشە گرانەکان حونجە و بڕگە دەکەن.

٢- قوتابییەکان دەقەکە دەخوێننەوە و مامۆستا داوایان لێ دەکات وشە گرانەکان شیبکەنەوە.



٣- مامۆستا دەقەکە لەبەر چاویان لادەبات و دەست بە خوێندنەوەی دەکات، ڕستە لە دوای ڕستە بە ڕوونی و هێمنی خوێندنەوەکە تەواو دەکات.

٤- دوای تەواوکردنی خوێندنەوە و نووسین، جارێکی تر مامۆستا دەقەکە بۆ قوتابییەکان دەخوێنێتەوە، ئەمەش بۆ ئەوەیە ئەوەی لەبیریان کردووە بینووسن.

٥- مامۆستا دەبێت لەبەردەم هەر قوتابییەك دەفتەری ڕێنووسی تایبەت بەو قوتابییە ڕاست بکاتەوە و هەڵە و ناتەواوییەکان دەستنیشان بکات، ئەوەی هەڵەی کردووە بە دروستی و لەبەر چاوی مامۆستا ڕاستییەکە بنووسێتەوە.

٦- پێویستە دوای ڕاستکردنەوەی هەڵەکان مامۆستا وشە دروستەکان بە جوانی پیشان بدات و گفتوگۆی لە سەر بکەن، هەروەها پێویستە وشە ڕاستەکە لە سەر دەفتەرەکە بۆ قوتابییان بنووسێتەوە، بۆ ئەوەی قوتابی هەڵە و کەموکورییەکان ببینێت (عاشور، ٢٠١٤: ١٣٥).

## گرینگیی ڕێنووسی بینراو

١- یارمەتیی بەستنەوەی گۆکردنی وشە و وێنەی نووسینەکە دەدات.

٢- هەنگاوێکی پێشکەوتووە لە پێناو ئامادەکاری بۆ چارەسەرکردنی سەختییەکانی ڕێنووس (عاشور، ٢٠١٤: ١٣٥-١٣٤).

## سێیەم/ ڕێنووس بە گوێگرتن

قوتابییان گوێ لەو پارچە دیاریکراوە دەگرن کە مامۆستا بۆیان دەخوێننەوە، پاش تێگەیشتن و گفتوگۆکردن، مامۆستا ناوەڕۆکی بابەتەکە بەتایبەتی ئەوانەی لەیەك دەچن بۆیان دەخوێنێتەوە و، ئەوانیش دەینووسنەوە بێ ئەوەی بیانبینن (ابومغلی، ٢٠١٥: ٧١).



## هەنگاوەکانی گوتنەوەی ڕێنووس بە گوێگرتن

١- دەستپێکێك بۆ پێشاندانی نموونەکانی نووسین، یان بەکارهێنانی پرسیارە ڕێگاخۆشکەرەکان.

٢- پێویستە مامۆستا بابەتی ئامادەکراو، کە پارچەیەکی بچووکە، بۆ قوتابییان بخوێنێتەوە بۆ ئەوەی بیرۆکەیەکی گشتیی لێ وەربگرن.

٣- پێویستە گفتوگۆ لە سەر واتەی گشتیی دەقەکە بکرێت و مامۆستا کۆمەڵێك پرسیار ئاراستەی قوتابییەکانی بکات.

٤- دەبێت مامۆستا وشە لێکچوو و گرانەکانی نێو دەقەکە حونجە بکات و هەندێکیش لە سەر تەختە بنووسێت، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت وشە گران و لێکچووەکان لە ڕستەی تەواو پیشان بدرێن و بنووسرێن، بۆ ئەوەی کاریگەریی هەبێت و سوود بە قوتابییەکانی ببەخشێت.

٥- پێویستە قوتابی دەفتەری ڕێنووس و قەڵەم و خەتکوژێنەوە و ئامرازەکانی نووسین ئامادە بکات و ڕۆژ و مێژوو و بابەتی ئامادەکراو بنووسن، لە کاتی ڕێنووس دەبێت مامۆستا ئەو وشانەی بۆ ئاسانکاری لە سەر تەختە نووسیبووی بیسڕێتەوە.

٦- پێویستە مامۆستا بۆ جاری دووەم دەقەکە بخوێنێتەوە تا قوتابییەکانی بۆ نووسین ئامادە دەبن و، هەوڵ بدەن وشە خوێندراو و لەیەکچوو و گرانەکان دەر بکەن لە تەك ئەوانەی هاوشێوەیانن کە لە سەر تەختەکە نووسرابوون (عاشور، ٢٠١٤: ١٣٥).

## کۆمەڵێك نموونەی جیاواز بۆ دەستنیشانکردنی سستی لە ڕێنووسدا

### نموونەی یەکەم

### تا ئێستاش لە کاتی نووسیندا هەڵە دەکەم

هەرچەندە ئێستا مامۆستام، بەڵام لە کاتی نووسیندا هەڵەی ڕێنووس و ڕێزمانیم زۆرە، هۆکارەکەی بۆ کەموکوڕیی وانەی ڕێنووس لە بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتی دەگەڕێنمەوە، چونکە لەم قۆناغەدا مامۆستای زمانی کوردی بە شێوەی پێویست گرینگیی بە ڕێنووس نەدەدا، بە جۆرێك زۆربەی بابەتەکان لە سەر ئێمە دەمانەوە، ئێمەش لە ماڵەوە خوێندەوارێکی ئەوتۆمان نەبوو کە دەرسەکانمان پێ بڵێتەوە و فێرمان بکات، دەرچوون و فێربوونی من جۆرێك لە سەرکێشیی تێدا بوو، چونکە تەنها خۆم هەوڵم دەدا و کەسێك نەبوو گرینگیم پێ بدات.

وانەی ڕێنووس ئەو وانەیە بوو کە زۆر ترسم لێی هەبوو، مامۆستای بابەتی کوردی لە پۆل وانەکەی بۆ دەستنیشان دەکردین و پێی دەگوتین بەیانی ڕێنووس دەکەین، من زۆر دەترسام، بە جۆرێك مامۆستا زۆر سەرزەنشتی دەکردین، دەبوایە پێش ئەوەی مامۆستا بێتە ژورەوە دەفتەر و قەڵەم ئامادە بێت، ئەوەی زۆر ترسمان لێی هەبوو بریتی بوو لە دواکەوتن، چونکە مامۆستا دوو جار دەیخوێندەوە و دەبوایە بە هەموو شتێك ڕابگەین، ئەگەر نا دەبوو بچینە سەر وشەیەکی تر، ئەمەش لە ڕێنووس نەدەچوو، بەڵکو لە پێشبڕکێ دەچوو.



کاتێك پۆلی دووەمی بنەڕەتی بووم، بیرم دێت ڕۆژێك یەکێك لە قوتابییە هاوپۆلەکانم کە دایکی مامۆستا بوو لە ژێر تەختەکە کتێبی دەرهێنا بوو و لە سەر کتێبەکە دەینووسییەوە، هۆکاری ئەم کارە هەڵەیە بریتی بوو لەوەی مامۆستا لە دوو جار زیاتر بۆی نەدەخوێندینەوە بۆ ئەوەی بە ڕێنووس ڕابگەین.

داوا لە مامۆستایانی بەڕێز دەکەم، بە وریاییەوە مامەڵە لەگەڵ وانەی ڕێنووس بکەن، چونکە ئەگەر لە بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتی قوتابی فێر نەبێت، هەرگیز فێر نابێت، بۆیە نەزانین و هەڵەکردن لە نووسین بە خەوشێکی زۆر دادەنرێت، من تا ئێستاش ئەم خەوش و کەموکوڕییەم لە نووسین هەیە و ناتوانم بە هیچ شێوەیەك قەرەبووی بکەمەوە.

## نموونەی دووەم

### لەبەر چی وازم لە خوێندن هێنا

من یەکێك بووم لەو قوتابییانەی دوای ٦ ساڵ وازم لە خوێندن هێنا، هەرچەندە توانیم بەم ٦ ساڵە تا پۆلی چوارەمی بنەڕەتی بخوێنم، بەڵام ئیتر بیرم کردەوە بەردەوام بوون لە خوێندن سوودێکی ئەوتۆم پێ ناگەیەنێت، بۆیە بڕیارم دا قوتابخانە جێ بهێڵم.

وانەی کوردی یەکێك بوو لەو وانانەی کە زۆر ئارەزووم لێی دەکرد و پێم خۆش بوو هەموو ڕۆژێك بیخوێنین، بەڵام بەداخەوە ڕێنووس و کتێب و مامۆستای کوردی لەبەر چاوم ناشرینیان کرد و وایان کرد ڕقم لە هەموویان بێت، چونکە ئەم وانەیە زۆر ئازاری دەدام و هەموو ئەو بابەتانەی بۆ ڕێنووس بوون لە سەر خۆمان دەمایەوە، مامۆستا زۆر توند بوو لەگەڵمان، ئێمە زۆر بچووك بووین و بەرگەری ئەم هەمووە توڕەبوونەمان نەدەگرت.

ڕێنووس هەموو شتێکی پێچەوانە کردەوە، ئێستا پرسیار لە خۆم دەکەم ئەگەر ڕێنووس نەبوایە ڕەنگە کۆلێژم تەواو کردبا، خۆزگە توانای بەردەوامبوونم دەبوو لە قوتابخانە، قوتابخانە ژیانێکی تایبەتە بۆ منداڵ، من نەمتوانی لەو ژیانە تایبەتە بەردەوام بم.

داوا لە مامۆستایان دەکەم گرینگی بە هەموو بابەتێك بدەن، هیچ شتێك بۆ قوتابی جێ مەهێڵن، قوتابی منداڵێکی بێتاوانە، مێشکی تەواو پێ نەگەیشتووە، پەلەکردن و توڕەبوون ئازار بە ناخی دەگەیەنێت، تکایە گرینگی بە وانەی ڕێنووس بدەن و خۆتان لەگەڵ قوتابییان ماندوو بکەن.



## نموونەی سێیەم

### دەق و وێنەکان بۆ قوتابی شی بکەنەوە

کاتێك گەورە بووم و چووم بۆ قۆناغی ئامادەیی و زانکۆ، ئینجا لە مانای بەشێك لەو دەق و وێنانە تێگەیشتم کە لە بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتی خوێندبووم، چونکە زۆربەی بابەتەکانم تەنها ئەزبەر دەکرد و لە ماناکانیان بە تەواوی تێنەدەگەیشتم، مامۆستاکانیش هێندە گرنیگییان بە شیکردنەوە و لێکدانەوەی دەق و وێنەکان نەدەدا.

ئەوەی زۆر گرینگە پێویستە مامۆستا لەم قۆناغەی خوێندن گرینگی بە شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی دەق و وێنەکان بدات، چونکە تەنها خوێندنەوە و نووسین و فێرکردنی پیت و دەنگەکان، ناتوانن بیرکردنەوەی قوتابی پڕ بکەن، بەڵکو دەبێت گرینگی بەشیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی پێویست بدرێت.

داوا دەکەم مامۆستا بابەتەکان بە ئاواز و گۆرانی بۆ قوتابییان ئەدا بکات، بۆ ئەوەی چێژبەخش بن و قوتابی ئارەزووی گوێگرتنی بکات و بیرکردنەوەی نەپچڕێت.

سەبارەت بە ڕێنووس، تەنها ئەرکی ماڵەوەمان پێ دەدرا و داوامان لێ دەکرا کە بۆ بەیانی خۆمان ئامادە بکەین بۆ ڕێنووس، ئەمەش تا ڕادەیەك قورس بوو، چونکە ئێمە بچووك بووین و ترس و دڵەڕاوکێی زۆرمان بۆ دروست دەبوو.

داوا لە مامۆستایان دەکەم بە هەموو شێوەیەك هەوڵی کەمکردنەوەی ترس و دڵەڕاوکێ بدەن، چونکە بوونی ترس و دڵەڕاوکێ هۆکارە بۆ دواکەوتن و سستیی فێربوون.

## نموونەی چوارەم

## ڕێنووس چی بوو؟

ئەو کاتەی لە بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتی قوتابی بووم، نەمدەزانی ڕێنووس چییە؟ ئەوەی ڕاستی بێت وانەی ڕێنووسمان هەبوو، بەڵام شتێکی ڕۆتینی بوو و ڕۆژانە ئەرکمان پێ دەدرا و ئێمەش لە ماڵەوە خۆمان بۆ ئامادە دەکرد، بەڵام نەمدەزانی ئەوە ڕێنووسە، واتە مامۆستا سەبارەت بە وانەی ڕێنووس هیچ شتێکی باس نەکردبوو، تەنها ئەوە نەبێت کە وانەیەك هەبوو بەناوی ڕێنووس.

کاتێك لە کۆلێژ لە بەشی زمانی کوردی وەرگیرام و وانەی ڕێنووس و گرینگیی ڕێنووسمان خوێندن، ئینجا بیرم کەوتەوە شتێك هەبوو بە ناوی ڕێنووس، بە شێوەیەکی گشتی وانەی ڕێنووسمان دەخوێند، بەڵام مامۆستا هیچ کات باسی ئەو وانە و گرینگیی ڕێنووسی بۆ نەکردبووین.

داوا لە مامۆستایانی قۆناغی بنەڕەتی دەکەم، وانەی ڕێنووس بکەن بە وانەیەکی سەرەکی و گرینگیی پێ بدەن، بۆ ئەوەی قوتابی لە کاتی گەیشتن بە قۆناغی ناوەندی و زانکۆ کێشەی بۆ دروست نەبێت، چونکە هەبوونی هەڵە لە ڕێنووسدا بە خەوشێکی گەورە دادەنرێت.

### سەرنج

بۆمان دەردەکەوێت وانەی ڕێنووس وانەیەکی گرینگ و کاریگەرە بۆ قوتابی، بە جۆرێك هەر خەوش و کەموکورتییەك لە قوناغی بنەڕەتی لە وانەی ڕێنووس، ڕاستەوخۆ کاریگەری لە سەر بیرکردنەوە و ئارەزووی قوتابی بۆ خوێندن دەکات.

ئەوەی زۆر گرینگە و لەم چاوپێکەوتنانە بۆمان ڕوون بووەوە بریتی بوو لە شیکردنەوە و ڕوونکردنەوە، مامۆستایان بە شێوەیەکی باش هەوڵی ڕوونکردنەوەی بابەت و دەقەکان نادەن، بگرە قوتابی تا گەورە دەبێت مانای هەندێکیان نازانێت و تێ ناگات بۆ چی ئەم بابەتانە دەخوێنێت؟ بۆیە پێویستە بەر لە خوێندن و فێرکردنی پیتەکان مامۆستا گرینگیی وانەکە بۆ قوتابییان ڕوون بکاتەوە.

## بەشی پێنجەم

## ڕێگاکانی گوتنەوەی ڕێنووس لە بازنەی یەکەمی قۆناغی بنەڕەتیدا

پۆلی یەکەمی بنەڕەتی

ڕێگای پێکهێنانەوەیی

ڕێگای ئەبجەدی (ناوی پیتەکان)

ڕێگای دەنگی

ڕێگای شیکردنەوەیی

ناسینەوەی پیتەکان

پۆلی دووەمی بنەڕەتی

پۆلی سێیەمی بنەڕەتی

## پۆلی یەکەمی بنەڕەتی

لەم قۆناغەدا بە شێوازی جیاواز هەوڵی ئەوە دەدرێت قوتابی فێری نووسین و خوێندنەوە بکرێت، لە هەمووی گرینگتر بریتییە لە فێرکردنی ڕێنووس، ئەویش هەنگاوێکی گرینگ و کاریگەرە، لە پۆلی یەکەمی بنەڕەتیدا ڕاهێنان بە قوتابی دەکرێت لە سەر دروستنووسی و فێربوونی نووسین و ناسینەوە و حونجەکردنی پیتەکان، بێگومان ئەم قۆناغەی نووسین و ڕاهێنانی ڕێنووس بە قۆناغی جیا دەکرێت و هەوڵ و ماندووبوونی زۆری دەوێت.

### ١- ڕێگای پێکهێنانەوەیی

کۆڵەگەی ئەم ڕێگایە بریتییە لە دەستکردن بە فێرکردنی پیتەکان، پاشان سەرکەوتن بۆ برگە و وشە، دواتریش بۆ ڕستە، لەم ڕێگایەدا مامۆستا سەرنجی منداڵان و زەینیان بۆ پیتەکانی ئەلف و بێ ڕادەکێشێت.

**ئەم ڕێگایە دوو جۆرە**

## یەکەم: ڕێگای ئەبجەدی (ناوی پیتەکان)

لەم ڕێگایەدا قوتابی ناوی پیتەکان لەبەر دەکات و پاشان فێری نووسینی پیتەکان دەکرێت، وەك:

ئەلف / ا /

بێ / ب /

پێ / پ /..... هتد. (ابومغلی، ٢٠١٥: ٣١).

## دووەم: ڕێگای دەنگی

ئەم ڕێگایە لەگەڵ ڕێگای ئەبجەدی یەك دەگرێتەوە لەوەی کە بە پیت دەست پێ دەکات، بەڵام لەم ڕێگایەدا پێشکەشکردن و فێرکردنی پیتەکان بەدەنگەکانیان دەبێت نەك بەناوەکانیان، و:

/ ب /

/ پ /

/ ت /... هتد. (ابومغلی، ٢٠١٥: ٣٣).



## ٢- ڕێگای شیکردنەوەیی

بنەمای ئەم ڕێگایە بریتییە لە شیکردنەوە، ئەم شیکردنەوەیە لە وشەوە دێتە خوارەوە تا دەگاتە پیت، ئەمەش پێچەوانەی ڕێگای پێکهێنانەوەییە بە هەرسێ لقەکەیەوە، ناوی، دەنگی، برگەیی.

پەیڕەوکەرانی ئەم ڕێگایە پێیان وایە منداڵ پێش ئەوەی بێت بۆ قوتابخانە، کۆمەڵە ناوێك دەزانێت و فەرهەنگی وشەی هەیە، بۆیە ئەو وشانەی پیشان دەدرێت، کە لە فەرهەنگی مێشکی ئەودا بوونیان هەیە (ابومغلی، ٢٠١٥: ٣٦).

### ڕێگای پێکهێنانەوەیی



## ڕێگای شیکردنەوەیی




ئەو هەنگاوانەی کە بە شێوەیەکی گرینگ و کاریگەر لەم قۆناغەدا کاری لە سەر دەکرێت بریتین لە:



## ١-ناسینەوەی پیت

ناسینەوەی پیت هەنگاوێکی گرینگە، کە پێی دەگوترێت (جیاکردنەوە و ڕوتەڵکردن)، لە پۆلی یەکەمی بنەڕەتیدا زۆر گرینگیی پێ دەدرێت و کۆمەڵێك وێنە بە قوتابی پیشان دەدرێت و داوای لێ دەکرێت ناوی وێنەکان بڵێت.

ئینجا پیتێکی بۆ دادەنرێت و مامۆستا بە قوتابییان دەڵێت ئەم وشەیەی ئەم پیتەی تێدایە هێڵێکی بە ژێردا بکێشن، وەك:

مۆز بۆق بزن قاز

لە دوای ئەم هەنگاوە، داوا لە قوتابی دەکرێت تەنها پیتی (ز) بخاتە ناو بازنەیەك، یان هێڵێك بە ژێر ئەم پیتەدا بکێشێت، وەك:

نەورۆز وەرزش زانکۆ شەقام

٢- لەم قۆناغەدا جۆرێکی تر لە رێنووس بەکار دەهێنرێت برتییە لە (رێنووسی بینراو و گواستراو)، ئەمەش لە رێگای ببینە و بڵێ، لە سەر کارت و تابلۆی گیرفاناوی دەگوترێتەوە.

ئەم جۆرە زیاتر تایبەتمەندە بە قۆناغی یەکەمی بنەڕەتی، قوتابی بۆ نووسینی وشە دەگەڕێتەوە بۆ ئەم دەقەی کە پێشتر خوێندوویەتی، یان لە رێگای سەر مەشق رێنووسی لە سەر دەکات، بەڵام لە رێگای سەرمەشق دەبێت قوتابی فێر بکرێت لە خوارەوە بۆ سەرەوە وشەکە بنووسێتەوە، چونکە ئەگەر بە پێچەوانەوە بینووسێتەوە رەنگە هەڵەیەك بكات تا كۆتایی بە دوای ئەم هەڵەیەدا بڕوات، بۆ نموونە:

بخوێنەوە، بنووسەوە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| دارا | زەردە | زارا | دادە |
| .......... | ............ | ............ | ............ |
| .......... | ............ | ............ | ............ |
| .......... | ............ | ............ | ............ |
| .......... | ............ | ............ | ............ |

خوێندنەوەی پۆلی یەکەم، وەرزی یەکەم، ٢٠١٨، ٣٥-٣٦.

## پۆلی دووەمی بنەڕەتی

لەم قۆناغەدا زیاتر گرینگی بە رێنووسی گواستراو دەدرێت، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك جار گرینگی بە رێنووسی بینراو دەدرێت، قوتابی بۆ رێنووس دەگەڕێتەوە سەر دەقەکە و سەیری دەکات و زانیارییەکان دەگوازێتەوە.

ئەم جۆرەی رێنووس لە سەر تەختە، یان لە سەر کتێبەوە ڕاستەوخۆ بۆ ناو دەفتەر دەگوازرێتەوە، ئەمەش کاتێك دەکرێت کە دەقەکە بە وردی خوێندرایەوە و گفتوگۆی واتەکەی کرابێت لە نێوان قوتابییان و مامۆستادا.

لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە هەندێك لە وشەکان حونجە بکرێن، بەتایبەت وشە گران و تازەکان، ئەم جۆرەی رێنووس زیاتر بۆ پۆلی دووەمی بنەڕەتی بەکار دێت و بە شێوەی ڕاهێنان نووسراوەتەوە لە نێو کتێبی پۆلی دووەمی بنەڕەتیدا، وەك ئەم نموونەیەی خوارەوە:

ئەم بۆشاییە پڕ بکەرەوە:

1- قوتابیم لە ............ .

2- هەر خوێندنە ............. .

3- لە باخی ژین ............. . (خوێندنەوەی پۆلی دووەمی بنەڕەتی، ٢٠١٨، ٢٠).

## پۆلی سێیەمی بنەڕەتی

لەم قۆناغەدا زیاتر ڕێنووسی گواستراو بەکار دێت، مامۆستا دەقەکە بە خوێندنەوەیەکی جوان و بەبێ هەڵە بۆ قوتابییان دەخوێنێتەوە، نابێت لە کاتی خوێندنەوەدا بابەتەکە بە قوتابی ببڕدرێت بۆ مەبەستی چاککردنی هەڵەی قوتابی، چونکە لە کاتی ڕاگرتن و چاککردنی هەڵە قوتابی سەری لێ دەشێوێت و تووشی هەڵەی تریش دەبێت، هەروەها دەبێت مامۆستا هەوڵی حونجەکردن و بڕگەکردنی وشە گرانەکان بدات.

حونجەکردن دەبێت لەلایەن قوتابییانەوە بێت و مامۆستا کام وشەی ویست، دەبێت بە داری ئاماژە ئاماژەی بۆ بکات بۆ ئەوەی قوتابی حونجەی بکات، بە هەمان شێوەی پۆلی دووەم، لە پۆلی سێیەم بە شێوەی ڕاهێنان ڕێك خراوە، وەك:

قوتابیی خۆشەویست ئەم بۆشاییانە پڕ بکەرەوە:

١-سەردان ڕەوشتێکی .......... .

٢-شێوازی .......... چۆنە؟ (خوێندنەوەی کوردی پۆلی سێیەم، ٢٠٠٨: ٣٧).

لەگەڵ ئەم شێوازانەی باسمان کردن، جۆرێکی تری ڕێنووس بریتییە لە ببینە و بنووسە، کە لە کتێبی قوتابییاندا وێنە هەیە و قوتابی سەیری وێنەکە دەکات و ناوەکەی لە ژێرەوە دەنووسێت.



# بەشی شەشەم

## هەندێ لایەنی نووسین و دەنگسازی

ئەلف و بێ

نووسین

دەنگەکانی زمانی کوردی

کۆمەڵەی نەبزوێنەکان

مێلگرافی کۆمەڵەی نەبزوێنەکان

جۆرەکانی نەبزوێنەکان

کۆمەڵەی بزوێنەکان

مێلگرافی کۆمەڵەی بزوێنەکان

جیاوازیی نێوان بزوێن و نەبزوێنەکان

لە جوڵەی زمان بە شێوەی ستوونی بزوێنەکان بەم شێوەیە ڕیز دەبن

مێلگرافی جووڵەی ستوونی

ئەندامەکانی ئاخاوتن لە مرۆڤ

تایبەتمەندیی ئەندامەکانی ئاخاوتن لە کاتی گۆکردنی بزوێنەکان

تایبەتمەندیی نەبزوێنەکان

مێلگرافی تایبەتمەندیی نەبزوێنەکان

تایبەتمەندیی بزوێنەکان

## ئەلف و بێ

ئەم وشەیە لە دوو پیتی یەکەمی گریکی و یۆنانی وەرگیراوە کە پێی دەگوترێت (ALPHA AND BET) (باڵدار، ٢٠١١: ١٨).

ئەلف و بێ سیستەمی نووسینی زمانە، هەموو زمانێك خاوەنی ئەلف و بێی تایبەت بەخۆیەتی، زمانی کوردیش ئەلف و بێی تایبەت بەخۆی هەیە، لەم توێژینەوەیەدا زۆر بە وردی باسی ئەلف و بێ و دەنگەکانی زمانی کوردی دەکەین.

کۆنترین ئەلف و بێی لاتینی مێژووەکەی بۆ سەدەی شەشەمی پێش زایین دەگەڕێتەوە، کە بە زمانی بەهلەوی بووە.

سۆمەرییەکان نزیکەی (٣٠٠٠) ساڵ بەر لە ئێستا شارستانییەکی مەزنیان هەبووە، یەکەمین کەس بوونە کە نووسینیان هەبووە و پەنایان بۆ بردووە.

لە دوای ئەمەش کورد بە ئەلف و بێی عەرەبی نووسیویەتی، هەرچەندە مێژووەکەی بە ڕوونی دیار نییە.

سەبارەت بە سەرتای سەرهەڵدانی ئەلف و بێی لاتینی لە ناو کورددا چەندین بیروبۆچوونی جیاواز هەیە کە ئاماژە بەوە دەکەن کۆمەڵەی هێڤی بیرۆکەی نووسینی کوردیی بەپیتی لاتینی هێنایە ئاراوە، فائیز بەگ یەکێك بوو لەوانە، چونکە خۆی ئەندامی ئەم کۆمەڵەیە بوو، ئەوان جەختیان لەوە دەکردەوە پیتە عەرەبیەکان پڕ بە پێستی نووسنی کوردی نین، لەبەر

ئەوە پێشنیار دەکرێت لابرێن و پیتی لاتینی لەبریان بەکار بێت.

عەبدوڵلا جەودەت لە وتارەکەی بەناوی (گوتار)، کە لە ژمارە (یەك)ی ڕۆژی کورد بڵاوی کردووەتەوە بە ئاشکرا بانگەشەی ئەوە دەکات کە بە پیتی لاتینی بنووسن (خۆشناو، ٢٠١٦: ٦١-٦٢).

ئەم کەموکوڕییانەی لە نیشانە دەنگییەکاندا هەیە، دەبنە کۆسپ و تەگەرە لە ڕێنووسی کوردی بە ئەلف و بێی عەرەبی، لە لێکۆڵینەوە و دیراسەکردنی دەنگەکانی زمانی کوردیدا بەتایبەت لە (بزوێن و نیمچە بزوێنەکان)، کێشە دروست دەبن.

ئەم هۆکارانە وایان لە شارەزا و پسپۆڕانی زمان کردووە، کە هانی خەڵك بدەن پەنا ببەنە بەر ئەلف و بێی لاتینی و لە نووسیندا بەکاری بهێنن بۆ ئەوەی خۆیان لەم کەموکوڕییانەی لە ئەلف و بێی عەرەبیدا هەیە بەدوور بگرن، ڕێنووسی لاتینی بە چەند شێوەی جیاواز وەرگیراوە ئەویش بە چەند هەوڵێکی تاکەکەسی ئەنجام دراوە، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە نیشانەکانی ئەلف و بێی جیهانی بەکار بهێنرێت، (عەلی، ٢٠١٤: ١٩١).

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمیشدا زۆربەی شاعیرەکان بە هەورامی و فارسی نووسینیان کردووە.



## نووسین

گومانی تێدا نییە داهێنانی هێماکانی نووسین بە درێژایی مێژوو یەکێك بووە لە درەوشاوەترین دەستکەوت و داهێنانەکانی مرۆڤایەتی، هێماکانی نووسین زۆر گرینگن، چونکە مرۆڤ یەکەم ئەزموونی بەرایی خۆی پێ نووسیوە، هەروەها ئەم نووسینانەی کە خەڵکی وڵاتی دیجلە و فوڕات و بلیمەتەکانی ڕۆخی ڕووباری نیل لە سەر دیواری پەرستگە و ئەشکەوتەکان لە سەر قوڕ و پەیکەر و پێستە نووسیویانە یارمەتیی زۆری ئادەمیزادی ئەم سەردەمەی داوە کە بە توانایەکی زۆرەوە بچێتە ناو مێژووی کۆنی ئەوان و بتوانێت لە ڕێگای ئەم نووسینانەی لە سەر دیوارەکان نووسراون شارەزاییەکی زۆر لەبارەی ژیان و مێژووی ئادەمیزادی ئەم سەردەمە کۆ بکاتەوە.

سۆمەرییەکان نزیکەی (٣٠٠٠) ساڵ بەر لە ئەمڕۆ شارستانییەکی مەزنیان هەبووە، یەکەمین کەسانێك بوون کە نووسینیان زانیوە و پەنایان بۆ بردووە، جۆری نووسینەکەیان بە (مێخی) مسماری ناونرابوو، (باڵدار، ٢٠١١: ١٧-١٨).

نووسین تایبەتمەندیی گوێدان بە یاسا و هەڵبژاردنی وشە و ڕستەی تێدایە (حاجی مارف: ٢٠١٤: ١٧٦)، لەگەڵ ئەوەشدا نووسین ڕەمزە بۆ ئاخاوتن، لەو کاتەی نووسین پەیدا بووە بە چەندین قۆناغی جیا جیا تێپەڕیوە، بەو واتەیەی لە یەك قۆناغ نەوەستاوە و گەشەی کردووە، لەگەڵ ئەمانەشدا چەندین ئاستەنگی هاتووەتە پێش، سەرەڕای ئەمانەش

توانیویەتی لەگەڵ سەردەمە جۆربەجۆرەکان بگونجێت و پەرە بە خۆی بدات.

بەهۆی نووسین توانرا شارستانیەتی مرۆڤ لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمی ئێستا بگوازرێتەوە، نووسین کۆمەڵێك تایبەتمەندیی گرینگی هەیە، ئەویش بریتییە لەوەی نووسین بەشێوەی هەڕەمەکی نییە، دەبێت لەگەل نووسیندا گرینگییەکی زۆر بە لایەنی خاڵبەندی بدرێت، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت کەسێك هەبێت بیخوێنێتەوە، نووسین لە پیت و هێما پیك دێت و چەندین قۆناغی تێپەڕاندووە تا گەیشتووەتە ئەم ئاستەی ئێستا، هەر قۆناغێك بایەخ و گرینگیی خۆی هەبووە.

نووسینی وێنەیی یەکەم قۆناغ بووە و کۆنترین جۆری نووسینە، لەم قۆناغەدا مرۆڤ وێنەی ئەو شتانەی دەکێشا کە مەبەستی بووە باسیان بکات و بۆ خوێنەرەکەی بینێرێت وەك (کەشتی، مرۆڤ، ڕووەك)، لە جیاتی هەر وشەیەك وێنەی ئەو شتەی کێشاوە کە ئاماژەی بۆ کردووە.

لە دوای ئەم قۆناغە نووسینی بیر هاتە کایەوە، کە ئەم قۆناغە بریتی بوو لە پێشاندانی واتەی ڕاستەوخۆی نیشانە و هێماکان، هەروەها یەکێك لەو بۆچوونانەی کە ئێستا قسەی لە سەر دەکرێت ئەوەیە نووسین تەنها بۆ پاراستنی دەنگ داهێنراوە و هەوڵی بیرە بۆ ئاخاوتن، کە مەبەست لێی گەیاندنی واتە و مەبەستە.

بەشێکی تر لە قۆناغی نووسین بریتییە لە نووسینی برگەیی لەم جۆرەیاندا پشت بە وێنە نەبەستراوە، بەڵکو پەنایان بۆ دەنگی هێماکان بردووە، کە قۆناغێکی گرینگ بەرەو پێشەوە چووە، لەم بوارەدا توێژەران



شوێنەوارێکی زۆریان لە دەستنووسە مێخییەکان دۆزییەوە، هەروەها بابلیەکان و سۆمەرییەکان زیاتر لەم جۆرە نووسینەیان بەکار هێناوە. لە لایەکی تر، بۆ نووسین لەم قۆناغەدا پەنا برایە بەر دەنگ و پیت، یەکەمین جۆری ڕێنووس، ڕێنووسی ئەلف و بێی یۆنانی بوو کە لە سەر بناغەی دەنگ و پیت ساز کرا (خۆشناو، ٢٠١٦: ١٤-٢٠).

## دەنگەکانی زمانی کوردی

دەنگەکانی زمان واتە دەنگەکانی ئاخاوتن، وەنەبێت ئەم دەنگانە تەنها بۆ نووسین سەرچاوە بن، بەڵکو بەر لە هەرشتێك کەرەستەی خودی ئاخاوتنن، چونکە ئاخاوتنی مرۆڤ لە دەنگ پێك هاتووە، ئەمەش بە ئاشکرا لە وشە و ڕستە دەردەکەوێت، دەنگ بچووکترین دانەی زمانە کە بە سەر پارچەی تردا دابەش نابێت.

کەواتە دەنگ بریتییە لە کۆمەڵێك شەپۆل کە بە هەوادا دەڕوات و خێرایی ڕۆیشتنەکەی لە دەوروبەری (١١٠٠) پێیە لە چرکەیەدا (تۆفیق، ٢٠٠٩: ٢).

**دەنگەکانی زمان لە سەر لەرینەوەی تاڵە باریکەکانی قورگ، کراون بە دوو کۆمەڵەوە ئەوانیش بریتین لە (نەبزوێن و بزوێن).**

### ١- کۆمەڵەی نەبزوێنەکان

ئەم دەنگانە لە کاتی درکاندنیاندا هەندێك لە ئەندامانی ئاخاوتن دێنەوە یەك، کە مەبەستمان لێی کرانەوە و داخرانە، بەم شێوەیە رێ لەو هەوایە دەگرێت کە لە سییەکان دێت و بە ئارەزووی خۆی نایەتە دەرەوە، چونکە ئەم ئەندامانە دەبن بە کۆسپ و تەگەرە و نایەڵن هەوا بە سەربەستی و بە ئارەزووی خۆی بێت و بچێت.

لە ئاکامی کۆدەنگی و توێژینەوە جیاوازەکانی زمانەوان و شارەزیان لە زمانی کوردیدا تا ئێستا (٢٩) نەبزوێن دیاری کراون کە ئەوانیش بریتین لە (ئ ، ب، د، گ، ج، ڤ، ز، ژ، ع. غ، ح، م، ن، ڵ، ل، ڕ، ر، و، ی، پ، ت، ك، چ، ف، ق، س، ش، خ، ه).




**مێڵگرافی کۆمەڵەی نەبزوێنەکان**



### جۆرەکانی نەبزوێنەکان

أ- **نەبزوێنە گرەکان:** ئەو دەنگانەن لە کاتی درکاندنیاندا لەرینەوەی تاڵە باریکەکانی قورگیان لەگەڵدایە ئەوانیش بریتین لە (ب، د، گ، ج، ز، ژ، ع، غ، م، ن، ڵ، ل، ڕ، ر، و، ی).

ب- **نەبزوێنە کپەکان:** ئەو دەنگانەن کە لە کاتی درکاندنیاندا لەرینەوەی تاڵە باریکەکانی قورگیان لەگەڵدا نییە ئەوانیش بریتین لە (ئ ،پ، ت، ك، چ، ح، ڤ، ف، ق، س، ش، خ، ه) (تۆفیق، ٢٠٠٩: ٣).

### ٢- کۆمەڵەی بزوێنەکان

لە زمانی کوردیدا (٨) پیتی بزوێن (بزوێن) هەیە، وەك (ە، ا، وو، و، ی، ێ، ۆ، (i) بزرۆکە)، ئەمانەش لەنێوان خۆیاندا دەبن بە دوو بەش:

**١- بزوێنی کورت:** ژمارەیان (٣) پیتە، کە بریتین لە: (i، ە، و).

**٢- بزوێنی درێژ:** ژمارەیان (٥) پیتە، کە بریتین لە: (ا، وو، ۆ، ی، ێ) (نەریمان خۆشناو، ٢٠١٣: ١٠).

کەواتە کۆمەڵەی بزوێنەکان ئەم دەنگانەن کە لە کاتی درکاندنیاندا هەوا بە سەربەستی و بە ئارەزووی خۆی لە سییەکان دێتە دەرەوە، لە هیچ شوێنێك رێی لێ ناگیرێت.




**مێلگرافی کۆمەڵەی بزوێنەکان**

**جیاوازیی نێوان بزوێن و نەبزوێنەکان**

١- لە کاتی درکاندنی نەبزوێنەکان هەوا بە سەربەستی لە سییەکان دەرناچێت، بەڵام لە کاتی درکاندنی بزوێنەکان هەوا بە ئارەزووی خۆی دەربازی دەبێت.

٢- نەبزوێنەکان زیاتر بە ئەندامانی ئاخاوتن دروست دەبن، بەڵام هەرچی بزوێنەکانن تەنیا یارمەتیی دروستبوونیان دەدات.

٣- نەبزوێنەکان دوو کۆمەڵەن کۆمەڵەیەکیان گڕ و کۆمەڵەیەکیان کپ، هەرچی بزوێنەکانن یەك کۆمەڵەن کە هەموویان گڕن.

٤- لە هەندیك باردا نەبزوێنی گڕ دەبێت بە کپ، وەك (د) لە وشەی (شاد)، هەرچی بزوێنەکانن لە هەموو شوێنێنك گڕن.



٥- نەبزوێنە گڕەکان لەرینەوەیان لەگەڵدایە، بەڵام نەبزوێنە کپەکان لەرینەوەیان لەگەڵدا نییە، هەرچی بزوێنەکانن لەرینەوەیان لەگەڵدایە (تۆفیق، ٢٠٠٩: ٤).

**لە جوولەی زمان بە شێوەی ئاسۆیی بزوێنەکان بەم شێوەیە ڕیز دەبن**

**١- بزوێنەکانی ڕیزی پێشەوە:** ئەم بزوێنانەن لە کاتی درکاندنیاندا زمان بەرەو پێشەوە دەچێت وەك: (ی، ێ).

**٢- بزوێنەکانی ڕیزی ناوەڕاست:** ئەم بزوێنانەن لە کاتی درکاندن و گۆکردنیاندا زمان لە ناوەڕاستی دەم دەبێت وەك: (ە، و، i).

**٣- بزوێنەکانی ڕیزی دواوە:** ئەم بزوێنانەن لە کاتی درکاندنیاندا زمان لە قووڵایی دەمدا دەبێت و بەرەو دواوە دەچێت وەك: (ۆ، وو، ا).




**مێلگرافی جوولەی زمان بە شێوەی ئاسۆیی**

**لە جوولەی زمان بەجشێوەی ستوونی بزوێنەکان بەم شێوەیە ڕیز دەبن**

**١- بزوێنەکانی ڕیزی سەرەوە:** ئەم بزوێنانەن لە کاتی درکاندنیاندا زمان بەرەو سەرەوە هەڵدەکشێ وەك: (وو، ی).

**٢- بزوێنەکانی ڕیزی ناوەڕاست:** ئەم بزوێنانەن لە کاتی درکاندنیاندا زمان لە ناوەڕاستی دەم دەبێت وەك: (ۆ، ێ، و، (بزرۆکە i).

**٣- بزوێنەکانی ڕیزی خوارەوە:** ئەم بزوێنانەن کە لە کاتی درکاندنیاندا زمان لە بەشی خوارەوەی دەم دەبێت وەك: (ا، ە) (تۆفیق، ٢٠٠٩: ٥).






**مێلگرافی جوولەی زمان بە شێوەی ستوونی**

## ئەندامانی ئاخاوتن لە مرۆڤ

ئاخاوتنی مرۆڤ لە ڕیزە دەنگێکی یەك لەدوای یەك پێك دێت، کە بە پێی دەستوورێکی زمانەوانیی ڕێکوپێك ڕیز کراون، ئەم دەنگانەی بۆ ئاخاوتن بەکار دێن، مەبەست لێی لە یەکتر گەیشتنە، لەگەڵ ئەوەشدا دەبن بە سەرچاوە بۆ نووسین، بۆیە پێویستە ئاوڕێك لە ئەندامانی ئاخاوتن بدرێتەوە، کە یارمەتیی دروستبوونی دەنگەکانی ئاخاوتن دەدەن.

لێرەدا هەوڵ دەدەین بەشێك لە کۆوانەکانی م. بەناز ڕەفیق تۆفیق، وەربگرین و لەم کتێبە سوودیان لێ وەربگرین کە بە شێوەیەکی زۆر دروست و جوان باس لە ئاخاوتن و ئەندامانی ئاخاوتنی مرۆڤ دەکات.

**زانایانی دەنگ ڕێڕەوی هەوایان بۆ چەند بەشێك دابەش کردووە**

**بەشی یەکەم:** ئەم بەشە پێك هاتووە لە سییەکان و سورێنچك کە دەوری سەرەکییان هەیە لە ناردنی هەوا بۆ بەشەکانی سەرووی خۆیان و دەنگەکانی لێ دروست دەبێت، ئەم کارەش لەلایەن سییەکانەوە ئەنجام دەدرێت.

بە بەرزبوونەوەی (سورێنچك) هەوا لە سییەکان دێتە دەرەوە، هەروەها بە نزمبوونەوەشی پێچەوانەکەی ڕوو دەدات و هەوا لە سییەکان دێتە ژوورەوە، جگە لەمەش پەراسووەکان بەهۆی چەند پارچە ماسولکەیەکەوە بە یەکەوە بەستراون و توانای کردنەوە و هاتنەوەیەکیان هەیە.

**بەشی دووەم:** ئەم بەشە لە سەرووی سورێنچك دەست پێدەکات تا دەگاتە بۆشایی دەم و لوت، ئەویش لەم ئەندامانە پێك دێت:

**أ: قورگ (ئەوگ):** قورگ دەکەوێتە سەرووی سورێنچك لە سێ کرکراگە پێك هاتووە، لەگەڵ ئەوەشدا دەوری سەرەکی دەبینێت لە دروست بوونی چەند دەنگێك، لە هەمان کاتیشدا هەڵدەستێ بەدروستکردنی هەموو وزە دەنگیەکان، لەگەڵ زمانەیەکیش هەڵەدەستێت بە ڕێکخستنی دەرچوونی هەوا.

**ب: ژێیەکانی قورگ:** ئەم بەشە بریتییە لە دوو دەستە ماسوولکەی نەرمی بەرامبەر یەکتر، ئەم دوو دەستە ماسوولکەیەش بە ئێسکەکانی لولەی



قورگەوە بەستراونەتەوە، ئەم ژێیانەی قورگ لەگەڵ جوولەیاندا چەند بارێکی تایبەتی وەردەگرن و کار دەکەنە سەر دەنگەکانی زمان بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- کرانەوەی ژێیەکانی قورگ و تێپەڕبوونی هەوا بێ ئەوەی ڕێگایان لێ بگیرێت، کۆمەڵێك دەنگ لەم بارەدا دروست دەبێت و بەم دەنگانەش دەڵێن (دەنگە کپەکان).

٢- کرانەوە و هاتنەوەیەکی ژێیەکان بە خێرایی یەك لە دوای یەك، لەگەڵ تێپەڕبوونی هەوا دەبێتە هۆی لەرینەوەی ژێیەکانی قورگ و کۆمەڵێك دەنگ لەم بارەدا دروست دەبێت پێیان دەڵێن (دەنگە گڕەکان).

**بەشی سێیەم:** ئەم بەشە لە کۆتایی قورگەوە دەست پێدەکات تا دەگاتە هەردوو لێو، لەم بەشانە پێك دێت:

**١- مەڵاشوو:** هەرچەندە سنوورێکی دیایکراو نییە کە بەشەکانی مەڵاشوو لە یەك جیا بکاتەوە، دانانی ئەم بەشانە زیاتر بۆ دەستنیشانکردنی سازگەی دەنگەکانە (شوێنی دەربڕینی دەنگەکان).

مەڵاشوو لەدوای ددانەکانی ریزی سەرەوە دەست پێدەکات، کە پێی دەگوترێت پووکی ددان، هەروەها مەڵاشووی ڕەقیشی پێ دەگوترێت، ئەم بەشەی مەڵاشوو توانای جووڵانەوەی نییە لە دەمدا، لە دوای ئەوەش مەڵاشووی نەرم دەست پێدەکات، کە دەوری گەورە لە گۆڕانی ڕێڕەوی هەوادا دەبینێت، چونکە لە کاتی دروستبوونی دەنگە زارییەکاندا مەڵاشووی نەرم بەرز دەبێتەوە و کونی لوت دەگرێت، بەمەش هەوا ناچێتە دەرەوە و کۆنسنانتە زارییەکان دروست دەبن، بەڵام لە کاتی نزمبوونەوەی مەڵاشووی

نەرمدا دەروازەی بۆشایی دەم دادەخرێت و هەوا ناتوانێت لەم بۆشاییەدا بچێتە دەرەوە، بۆیە لەم حاڵەتەدا دەنگە لوتییەکان دروست دەبن.

**١- زمان:** زمان وەك ئەندامێکی کاریگەر دەورێکی گەورە لە دروستکردنی دەنگەکاندا دەبینێت، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئاسان جووڵەی ئەم ئەندامە لەناو دەمدا، زانایانی دەنگ زمانیان کردووە بە سێ بەش ئەوانیش بریتین لە:

**أ- پشتەوەی زمان:** ئەم بەشە بەرانبەر مەڵاشووی نەرمە و کۆتایی بە ڕەگی زمان دێت.

**ب: ناوەڕاستی زمان:** ئەم بەشە بەرانبەر مەڵاشووی ڕەق دەوەستێت.

**ج: پێشەوەی زمان:** ئەم بەشە بەرانبەر پووکی ددانە، هەروەها ئەم بەشە نووکی زمان دەگرێتەوە )تۆفیق، ٢٠٠٩: ٥-٧).



## تایبەتمەندیی ئەندامەکانی ئاخاوتن لە کاتی گۆکردنی بزوێنەکان

**١- باری لێو:** لە سەرێکەوە هەردوو لێو بەرەو پێشەوە دەچن و لە یەکتر نزیك دەبنەوە، لەم بارەدا هەرسێ بزوێنی (و، وو، ۆ) دروست دەبن.

لە سەرێکی تر هەردوو لێو بەرەو تەنیشت دەکشێن، لەم بارەدا هەردوو بزوێنی (ی، ێ) دروست دەبن، یان لێوەکان لە یەکتری جودا دەبنەوە لەم بارەشدا بزوێنی (ە، ا، i) دروست دەبن.

**٢- ئەندازەی کردنەوەی دەم**

**أ: کردنەوەی کەم، یان تەنگ:** ئەمە لە کاتێکدا دەبێت کە بزوێنەکانی (و، وو، ی، i) گۆ دەکرێن.

**ب: کردنەوەی مامناوەندی:** لە کاتێکدا دەبێت کە هەرسێ بزوێنی (ێ، ۆ، ە) گۆ دەکرێن.

**پ: کردنەوەی کراوە:** ئەم شێوازە لە کاتێك دەبێت کە بزوێنی (ا) گۆ دەکرێت.

## تایبەتمەندیی نەبزوێنەکان

پیتە نەبزوێنەکان کۆمەڵێك تایبەتمەندیی جیاوازیان هەیە، کە ئەم تایبەتمەندییانە لە یەکتریان جیا دەکاتەوە، لێرە هەوڵ دەدەین باسی ئەو تایبەتمەندییانە بکەین و بە شێوەی ڕیزبەندی لە یەکتر جیایان بکەینەوە، تایبەتمەندییەکانیش بریتین لە:

**١- ئ:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا قوڕگییە، دەنگێکی کپە، (خۆشناو، ٢٠١٦: ٨٩).

**٢- ب:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا لێوەکییە، هەردوو لێو بەشداری لە درکاندنیدا دەکەن، دەنگێکی گڕە.

**٣- پ:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا لێوەکییە، هەردوو لێو بەشداری لە درکاندنیدا دەکەن، دەنگێکی کپە.

**٤- ت:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا زمانەکییە، لە کاتی گۆکردنیدا زمان بەرەو پێشەوە دەچێت، دەنگێکی کپە.

**٥- ج:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا زمانەکییە، دەنگێکی گڕە.

**٦- چ:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا زمانەکییە، دەنگێکی کپە.

**٧- ح:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا قوڕگییە، دەنگێکی کپە.

**٨- خ:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا قوڕگییە، دەنگێکی کپە (نەریمان خۆشناو، ٢٠١٣: ٢٦-٢٧).



**٩- د:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا زمانەکییە، پێشەوەی زمان بەشدار دەبێت لە دروستکردنیدا، دەنگێکی گڕە.

**١٠- ر:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا زمانەکییە، لە کاتی گۆکردنیدا زمان بەرەو پێشەوە دەچێت، دەنگێکی گڕە.

**١١- ڕ:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا زمانەکییە، لە کاتی گۆکردنیدا زمان بەرەو پێشەوە دەچێت، دەنگێکی گڕە.

**١٢- ز:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا زمانەکییە، پێشەوەی زمان بەشداری لە دروستکردنی دەکات، دەنگێکی گڕە.

**١٣- ژ:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا زمانەکییە، دەنگێکی گڕە.

**١٤- س:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا زمانەکییە، دەنگێکی کپە.

**١٥- ش:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا زمانەکییە، دەنگێکی کپە.

**١٦- ع:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا قوڕگییە، دەنگێکی گڕە.

**١٧- غ:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا قوڕگییە، دەنگێکی گڕە.

**١٨- ف:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕین لێوەکییە، دەنگێکی کپە.

**١٩- ڤ:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا لێوەکییە، دەنگێکی کپە.

**٢٠- ق:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا قوڕگییە، لە کاتی گۆکردنیدا زمانە بچکۆلە دەورێکی سەرەکی دەبینێت، دەنگێکی کپە.

**٢١- ك:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا زمانەکییە، لە کاتی گۆکردنیدا زمان بەرەو دواوە دەچێت، دەنگێکی کپە.

**٢٢- گ:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا زمانەکییە، لە کاتی گۆکردنیدا زمان بەرەو دواوە دەچێت، دەنگێکی گڕە.

**٢٣- ل:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا زمانەکییە، لە کاتی گۆکردنیدا زمان بەرەو پێشەوە دەچێت، دەنگێکی گڕە.

**٢٤- ڵ:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا زمانەکییە، لە کاتی گۆکردنیدا زمان بەرەو پێشەوە دەچێت، دەنگێکی گڕە.

**٢٥- م:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا لوتییە، دەنگێکی گڕە.

**٢٦- ن:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا لوتییە، لە کاتی درکاندیدا زمان بەرەو پێشەوە دەچێت، دەنگێکی گڕە. (تۆفیق، ٢٠٠٩: ١٠-١١).

**٢٧- هـ:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا قورگییە، دەنگێکی کپە (خۆشناو، ٢٠١٣: ٦٦).

**٢٨- و:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا لێوەکییە، هەردوو لێو بەشداری لە دروستکردنیدا دەکەن، دەنگێکی گڕە (خۆشناو، ٢٠١٣: ٧٢).

**٢٩-ی:** ئەم دەنگە لە شوێنی دەربڕیندا زمانەکییە، لە کاتی درکاندیدا زمان لە ناوەڕاستی دەم دەبێت، دەنگێکی گڕە (خۆشناو، ٢٠١٣: ٨٠).

**مێلگرافی تایبەتمەندیی نەبزوێنەکان**

## تایبەتمەندیی بزوێنەکان

**١- ە:** بزوێنێکی کورتە، لە کاتی گۆکردنیدا زمان لە ناوەڕاستی دەمدا دەبێت و هەردوو لێوەکان لە یەکتری جودا دەبنەوە (خۆشناو، ٢٠١٣: ٦٨).

**٢- ا:** بزوێنێکی درێژە، لە کاتی درکاندنیدا زمان لەپشتەوەی دەم دەبێت و هەردوو لێوەکانیش لە یەکتر جودا دەبنەوە (خۆشناو، ٢٠١٣: ١٤).

**٣- ۆ:** بزوێنێکی درێژە، لە کاتی گۆکردنیدا زمان لە پشتەوەی دەمدا دەبێت و هەردووو لێوەکانیش بەرەو پێشەوە دەچن و لە یەك نزیك دەبنەوە (خۆشناو، ٢٠١٣: ٧٠).

**٤- و:** بزوێنێکی کورتە، لە کاتی درکاندنیدا زمان لە ناوەڕاستی دەمدا دەبێت و هەردوو لێوەکانیش بەرەو پێشەوە دەچن.

**٥- وو:** بزوێنێکی درێژە، لە کاتی گۆکردنیدا زمان لە پشتەوەی دەمدا دەبێت

و هەردوو لێوەکان بەرەو پێشەوە دەچن (خۆشناو، ٢٠١٣: ٧٤-٧٦).

**٦- ی:** بزوێنێکی درێژە، لە کاتی گۆکردندا زمان بەرەو پێشەوە دەچێت و هەردوو لێوەکانیش بەرەو تەنیشت دەکشێن.

**٧- یٚ:** بزوێنێکی درێژە، لە کاتی درکاندنیدا زمان بەرەو پێشەوە دەچێت و هەردوو لێوەکانیش بەرەو تەنیشت دەچن (خۆشناو، ٢٠١٣: ٧٨-٨٢).

**٨- (i) بزرۆکە:** بزوێنێکی کورتە، لە کاتی درکاندیندا زمان لە ناوەڕاستی دەمدا دەبێت و هەردوو لێو لە یەکتر جودا دەبنەوە (خۆشناو، ٢٠١٦: ٩٢)، لەگەڵ ئەوەشدا بزوێنێکی سرك و جێگیرە، لە هەر شوێنێکدا (نەبزوێن)ێك لە تەنگژەدا بێت، بزرۆکە پەیدا دەبێت و جووتە دەنگی بۆ دەرەخسێنێت، هەر کاتێکیش تەنگژەکە نەما ون دەبێت (بابان، ٢٠١٨: ٤)

## بەشی حەوتەم

## خاڵبەندی

خاڵ (.)

جووت خاڵ (دوو خاڵ) (:)

(بۆر) کۆما (،)

(خاڵبۆر) کۆمای خاڵدار (؛)

تەقەڵ (-)

هێڵی لار (/) .

نیشانەی سەرسوڕمان (!).

نیشانەی پرسیار (؟).

ئەستێرە (*).

جووت چکۆڵە»«

کەوانەی بچووك ().

جووت کەوانەی بچووك (())

کەوانەی گەورە [ ].

## خاڵبەندی

خاڵبەندی ئەو نیشانانەن لە نووسیندا بەکار دەهێنرێن و گرینگی و تایبەتمەندیی خۆیان هەیە.

خاڵبەندی وەك نیشانەی هاتووچۆ وایە بۆ خوێنەر، مەبەست لە نیشانەی هاتووچۆ ئەوەیە چەندە نیشانەی هاتووچۆ گرینگە بۆ شوفێر لە کاتی شوفێریکردن، بە هەمان شێوە نیشانەکانی خاڵبەندی ئەوەندە گرینگن بۆ خوێنەر کاتێك دەقێك دەخوێنێتەوە (خۆشناو، ٢٠١٦: ١٣٤).

کەواتە خاڵبەندی کۆمەڵێك هێما و نیشانەن کە بە هۆیانەوە پرۆسەی خوێندنی دەق ڕوونتر و ئاسانتر دەکەن، لەم پرۆسەیەدا بەستنەوە و نەبەستنەوەی وشەکان بە یەکەوە دەخرێتە ڕوو و نیشانەکانی خاڵبەندی زۆر و جۆراوجۆرن، بەڵام باوترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

**١- خاڵ (.)**

ئەم نیشانەیە کاتێك دادەنرێت کە ڕستەیەك واتەیەکی تەواوی هەبێت و ڕستەیەکی سەربەخۆ بێت، ئەمەش بە واتەی تەواوبوونی ڕستەکەیە، هەروەها ئەم نیشانەیە لە کۆتایی هەموو ڕستەیەك دادەنرێت جگە لە ڕستەی پرسیار و سەرسوڕمان (کاروانی، ٢٠١٨: ٤١) وەك:

ئازاد نانی خوارد.

لەگەڵ ئەوەشدا خال بۆ کورتکردنەوەی هەندێك نازناو و پیشە و ڕێککەوت دادەنرێت وەك:

بۆ نازناوی زانستی وەك (پ.) = پرۆفیسۆر

(د.) = دکتۆر

(پ.ز.) = پێش زایین

(د.خ) = درودی خوای لە سەر بێت

دەبێت خاڵ بە وشەی پێش خۆیەوە بلکێندرێت وەك:

هەولێر شارێکی خۆشە.

لەگەڵ ئەوەشدا (...) سێ خاڵ لە نێو دەقدا مانای وایە وشەیەك فڕێ دراوە، بەڵام ئەگەر (....) چوار خاڵ هەبوو واتە لە وشەیەك زیاتر فڕێ دراوە، بەڵام هەبوونی (..........) دێرێك لە خاڵ واتە دێرێك تا پەرەگرافێك فڕێ دراوە (جوکل، ١٩٩٩: ١٣١).

**٢-جووت خاڵ (دوو خاڵ) (:)**

دوو خاڵ بۆ درێژەدان و ڕوونکردنەوە و ڕاکێشانی سەرنجی خوێنەرە، هەروەها بۆ پێشکەشکرنی لیستەیەك، واتە لە نێوان شت و جۆرەکانی بەکار دەهێنرێت.



زانکۆی سەڵاحەدین لە چەند کۆلێژێك پێك دێت لەوانە:

(زمان، ئەندازیاری)

لەگەڵ ئەوەشدا لە دوای ناوی قسەکەر لە کاتی گفتوگۆدا بەکار دەهێنرێت، وەك:

زانای بواری زمانەوانی دەڵێت: زمان هێزە.

**٣-(بۆر) کۆما (،)**

کۆما پشوویەکی کورتە، دادەنرێت بۆ ئەوەی وا لەڕستە بکات ئاسان بخوێندرێتەوە و ڕوون بێت، بۆر چارەسەرێکی باشە بۆ ڕستەی دوورودرێژ (ئەبابەکر، ٢٠١٨).

ئەم نیشانەیە واتەی ڕاوەستانە لە خوێندنەوەدا، بەڵام بۆ ماوەیەکی کەم، لە چەند کاتێکی جیاواز و لە نێوان ڕستەی جیاواز بەکار دەهێنرێت، وەك:

أ- لە نێوان جۆر و پارچەکانی شتێك، یان واتەیەك بەکار دەهێنرێت، هەروەها لە نێوان ڕستەی مەرجدار و دەربڕینی سوێندخواردن بەکار دێت، وەك:

ئەگەر ویستت بێیت بۆ لام، دەبێت ئاگاداری خۆت بیت.

سوێند دەخۆم، من ئەمەم نەکردووە (کاروانی، ٢٠١٨: ٤١).

ب- لە نێوان ئەو شتانەی دەژمێردرێن، وەك:

(کوڕێکی باش، باشی هەبوو)

پ- دوا بەدوای ناوی بانگکراو، وەك:

کوڕینە، بخوێنن.

ت- لە دوای وشەی بەڵێ، نەخێر، نا.

ج- لە پێش ئامرازی لێکدەری (و، یان، یا) بە مەرجێك نەکەوتبنە سەرەتای ڕستە، وەك:

کتێبەکە بخوێنەوە، یان منداڵەکە فێر بکە.

چ- لە ڕستەی لێکدراو دەتوانرێت لە بری ئامرازی لێکدەری (و) بەکار بهێنرێت، وەك:

نەسرین چوو بۆ قوتابخانە، کتێبەکانی لەگەڵ خۆی برد، هاوڕێکانی لە پۆل بینی.

ح- دەتوانرێت لەبری (کە)ی لێکدەر لە ڕستەدا بەکار بهێنرێت (ئەبابەکر، ٢٠١٨) وەك:

بە باشی دەزانم، بە یەکەوە بچین بۆ بازار.

تێبینی/ دەبێت کۆما (بۆر) بە وشەی پێش خۆی بلکێندرێت و بۆشایی هەبێت لەگەڵ وشەی دوای خۆی.



**٤- (خاڵبۆر) کۆمای خاڵدار (؛)**

کۆمای خاڵدار بۆ وچانکردنێکی درێژتر لە کۆمای ئاسایی، زۆربەی کات لەو ڕستانە بەکار دێت کە زۆر لە یەکتر نزیکن و کۆمای خاڵداریش لە بری خاڵ دادنرێت، وەك:

لەم ساڵانەی دواییدا؛ کوردێکی زۆر پەڕێوەی هەندەران بوون (ئەبابەکر، ٢٠١٨).

لەگەڵ ئەوەشدا کۆمای خاڵدار لە نێوان دوو ڕستەدا بەکار دەهێنرێت، کە ڕستەی دووەم وەڵامە بۆ ڕستەی یەکەم، وەك:

منداڵەکە زیرەکە؛ چونکە باوکی مامۆستایە.

**٥- تەقەڵ (-)**

ئەم نیشانەیە بەشەکانی پێشەوەی خۆی بەدوای خۆی دەبەستێتەوە، لە لایەکی تر بۆ جیاکردنەوەی وتەی دوو کەس بەکار دێت، وەك:

پێویستە مامۆستا زیاتر گرینگی بە قوتابییەکانی بدات- ئەوسا گلەیی لە خانەوادەکەی بکات.

**٦-هێڵی لار (/)**

ئەم نیشانەیە بۆ نووسینی ڕێککەوت بەکار دێت بۆ جیاکردنەوەی ڕۆژ و مانگ و ساڵ، وەك:

٢٠٢١/٢/١٧

هەروەها بۆ نووسینی دابەشکردن لە نێو دەقێك کە پیتی تێدا بەکار هاتووە، وەك:

خێرایی تیشك ١٠٠ کم/ چرکەیە

**٧- نیشانەی سەرسوڕمان (!)**

ئەم نیشانەیە هەم بۆ سەرسوڕمانە، هەم بۆ ئەمرکردن و داواکردن.

لە کۆتایی ئەم وشە و ڕستانە دێت کە سەرسوڕمان، یان پەژارە و هەستێکی دەروونییان تێدایە. وەك:

١. ئای ئەوە لێرەیت!

٢. ئۆخەی کوردستان ئازاد بوو!

٣. ئای لەو کانییە چەند سازگارە!

**٨-نیشانەی پرسیار (؟)**

ڕستەی پرسیاریش ئەو جۆرە ڕستەیەیە کە قسەکەر بۆشایی لە قسەکردنی هەیە و دەیەوێت بە پرسیارکردن زانیاریی پێویست بەدەست



بهێنێت (خۆشناو، ٢٠١٦: ١٣٤،١٣٥)، نیشانەی پرسیار لە کۆتایی ڕستەی پرسیاری دادەنرێت، وەك:

بۆچی نەهاتی؟

بۆچی زوو ئاگادارت نەکردمەوە؟

ئایا دەزانی ئاڵای کوردستان چەند ڕەنگە؟

**٩- ئەستێرە (*)**

ئەم نیشانەیە زیاتر بۆ پەراوێز بەکار دێت، نووسەر دەیەوێت ڕوونکردنەوە لە سەر بابەتێکی لابەلا بدات لە پەراوێز.

**١٠- جووت چکۆڵە »«**

هەندێك کات لە بری جووت کەوانەی بچووك ئەم نیشانەیە «» دادەنرێت، ئەم هێمایە لەم شوێنانە بەکار دێت.

١- کاتێك گرینگییەکی تایبەت بە وشەیەك، یان دەستەواژەیەك دەدرێت، وەك:

زانایان «زمان» بە بنەمای پەیوەندیکردن دادەنێن.

٢- کاتێك وتەیەك ڕاستەوخۆ دەگێڕدرێتەوە و دەستکاری ناکرێت، وەك:

قازی موحەممەد چاو نەترسانە ڕووی تێکردن «ئێوە ئەمڕۆ قازی موحەممەدێك دەکوژن، بەیانی لە هەر دڵۆپە خوێنێکی من سەدان قازی موحەممەدی تر سەر هەڵ دەدەن»

تێبینی: ئەگەر ڕستە، یان وتەکە بە خاڵ، بۆر، نیشانەی پرسیار، یان سەرسوڕمان کۆتایی هاتبوو، بە هەمان شێوە دەخرێتە نێو جووت چکۆڵە (ئەبابەکر، ٢٠١٨).

**١١- کەوانەی بچووك ()**

ئەم نیشانەیە بۆچەند مەبەستێك بەکار دێت، وەك:

1. ساڵی لەدایکبوون و مردنی کەسێك (١٩٨٠- ٢٠٠٥).
2. لەنێوان ڕستەدا دەستەواژەیەك، یان وشەیەك دەخرێتە نێوان کەوانەی بچووك کە مانایەکی تایبەتی هەبێت.

**١٢- جووت کەوانەی بچووك (())**

ئەم نیشانەیە کاتێك بەکار دێت ئەگەر دەقێك وەك خۆی وەربگیرێت، بەبێ دەستکاری و گۆڕانکاری، وەك:

((زمان هێزە)).

**١٣-کەوانەی گەورە [ ]**

کەوانەی گەورە زیاتر بۆ ڕوونکردنەوە بەکار دێت، کاتێك دەتەوێت بابەتێك لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی دیکە وەربگێڕیت، هەروەها لە پەراوێزیش سوودی لێ وەردەگیرێت بە تایبەت ئەگەر لە کاتی نووسیندا زانیمان دەقێك هەڵەی ئاشکرا و بەرچاوی تێدایە ئەوا ڕاستییەکەی لەنێوان کەوانەی گەورە دەنووسرێت.

## هۆکارەکانی دابەزینی ئاستی نووسینی قوتابییانی زانکۆ لە نووسینی کوردیدا

١- بایەخ نەدان بە فێرکردنی خوێندنەوە و فێرنەبوونی شێوەی پیتەکان لە قۆناغی بنەڕەتیدا.

٢- پەڕینەوەی قوتابی تا پۆلی چوارەمی بنەڕەتی، ئەمە یەکێك بوو لەو بڕیارانەی نەوەیەکی نەخوێندەواری پێگەیاند، ئەم کاریگەرییە نەرێنییەی کە لە سەری دروست بوو تا کۆتایی تەمەنی ناتوانێت قەرەبووی بکاتەوە.

بە شێوەیەکی گشتی ئەو قوتابییانەی بەر بڕیاری پەڕینەوە کەوتن، ئێستاش نووسین و ڕێنووسیان وەك پێویست نییە، یان ئەوەتا لە دوای قۆناغی چوار قوتابخانەیان جێهێشت.

٣- ئاگادار نەبوونی مامۆستای زمانی کوردی لە ڕێگاکانی وانەگوتنەوە، بەتایبەت لە ڕێنووس کە زۆر دواکەوتووانە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت.

٤- گرینگی نەدان بە ئەرکی ماڵەوە، ئەمەش دەکەوێتە ئەستۆی دایکان و باوکان، چونکە ئەرکی ماڵەوە تەواوکەری ئەو ئەرك و خوێندنەیە کە مامۆستا لە قوتابخانە فێریان دەکات.

٥- هەر کەمتەرخەمی و سستیەك لە قۆناغی بنەڕەتی هەبێت، جا قوتابی، یان مامۆستا و دایك و باوك، هۆکاری کەمتەرخەمییەکە بن ئەوا لە قۆناغی ئامادەیی و زانکۆ قوتابی باجەکەی دەدات.

## ڕاسپاردەکان

١- پۆلی یەك تا چواری بنەڕەتی، بناغەی فێربوونی نووسینە، بۆیە پێویستە مامۆستا بە وریاییەوە مامەڵە لەگەڵ ئەم قۆناغە بکات، کەلێنەکانی رێنووس بە بێخەمی جێ نەهێڵرێت (مامۆستا خەمی لێ بخوات).

٢- وەزارەتی پەروەردە بایەخ بە دەفتەری تایبەت بە خەت و رێنووس بدات.

٣- کتێبەکانی خوێندنەوەی کوردی دەوڵەمەند بن بە چالاکییەکانی بەهێزکردنی توانای دروستنووسی، بە ئەلف و بێی پەیڕەوکراو.

٤- لە کۆلێژەکانی پەروەردەی بنەڕەتی بایەخ بە گوتنەوەی خەت و رێنووس بدرێت.

٥- پسپۆڕانی بواری پەروەردە گرینگی بە توێژینەوەی هاوشێوە بدەن و پێداچوونەوەی بۆ بکەن، لەگەڵ ئەوەشدا کەموکورتییەکانی چاك بکەنەوە و لایەنە باش و بەهێزەکانی پەرە پێ بدەن، بۆ ئەوەی سوود بە مامۆستا و قوتابی بگەیەنێت لە داهاتوودا.

٦- لە کۆلێژەکانی پەروەردەی بنەڕەتی، وانەی رێنووس بۆ قوتابییان دابنرێت، چونکە قوتابییانی ئەم کۆلێژە دەبن بە مامۆستا، ناکرێت کەسێك مامۆستا بێت و شارەزایی لە نووسین و رێنووسی کوردی نەبێت.

## ئەنجام

١- ڕێنووس بریتییە لە کۆمەڵێك پەیڕەو و یاسا کە بە هۆیەوە ئاخاوتنی ئێمە دەنووسرێت، ئەگەر نووسەر لە دەستوور و یاسا پەیڕەوکراوەکانی ڕێنووس لا بدات تووشی هەڵەی ڕێنووس دەبێت، ئەم جۆرە هەڵانەش کۆسپ دێننە ڕێگای خوێندنەوە.

٢- ئەلف و بێ سیستەمی نووسینی زمانە و هەموو زمانێك خاوەنی ئەلف و بێی تایبەت بە خۆیەتی، هەندێك لە زمانەکانیش سوودیان لە ئەلف و بێی یەکتر وەرگرتووە و بەدەستکارییەوە لە نووسینی زمانەکەی خۆیان پەیڕەوی دەکەن.

٣- دۆزینەوەی هێماو نیشانەکانی نووسین لە هەرە باڵاترین و کۆنترین شارستانی ئادەمیزادن و بەو هۆیە توانیویانە کۆمەڵێك شارستانیی گەورە و پڕ بایەخ بەیەکەوە بنێن.

٤- خاڵبەندی کۆمەڵێك هێما و نیشانەن کە پرۆسەی خوێندنەوەی دەق ڕوونتر و ئاسانتر دەکەن.

٥- بازنەی یەکەمی خوێندن قۆناغێکی گرینگە بۆ فێربوون و نووسین، بۆیە مامۆستا دەبێت گرینگییەکی زۆر بەم قۆناغە بدات، چونکە دەبێتە بناغەیەکی گرینگ بۆ قۆناغەکانی تری خوێندن.

## لیستی سەرچاوەکان

زمانی کوردی


1. ابو مغلی، سمیع، وەرگێڕانی ئیبراهیم قادر محمد (٢٠١٥)، چاپی دووەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر.

2. بابان، شێرکۆ (٢٠١٨)، فۆنیمی نیمچەبزوێن لە دەنگسازیی کوردیدا، دەزگای گۆڤار، چاپی یەکەم، هەولێر.

3. باڵدار، ئیبراهیم ئەمین (٢٠١١)، ئامادەکاری بۆ فێربوونی خوێندنەوە و نووسین لە قۆناغی بنەڕەتیدا، و. ئیبراهیم قادر جاف، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر.

4. تۆفیق، بەناز ڕەفیق (٢٠٠٩)، کۆوانە - دەنگسازی، قۆناغی یەکەم، کۆلێژی پەروەردەی بنەڕەتی - زانکۆی سۆران.

5. جەباری، عومەر یاسین (٢٠٠٩)، کۆوانە - دەروونزانیی گشتی، قۆناغی یەکەم، کۆلێژی پەروەردەی بنەڕەتی - زانکۆی سۆران.

6. جوکل، علی محمود (١٩٩٩)، چاپی یەکەم، چاپخانەی زانکۆی سەڵاحەددین، هەولێر.

7. حاجی مارف، ئەورەحمان، پێداچوونەوەی نەریمان خۆشناو (٢٠١٤) چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر.

8. خۆشناو، نەریمان عەبدوڵلا (٢٠١٣)، فێربوونی پیتەکانی زمانی کوردی، چاپخانەی هێڤی، چاپی یەکەم، هەولێر.

9. خۆشناو، نەریمان عەبدوڵلا (٢٠١٦)، ڕێنووس و خاڵبەندی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر.

10. عەلی، تالیب حوسێن (٢٠١٤)، زانستی زمان و زمانی کوردی، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر.

11. قەرەداغی، ئاوات محمد امین (٢٠١٠)، کۆوانە، ڕێنمایی دەروونی، زانکۆی سەڵاحەددین، هەولێر.

12. کاروانی، بەکر شاکر (٢٠١٤)، کۆوانە - ڕێبازی توێژینەوە، ماستەر، سمیستەری یەکەم، کۆلێژی پەروەردەی بنەڕەتی، زانکۆی سەڵاحەددین، هەولێر.

13. لێژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە، (٢٠١٨)، خوێندنەوەی کوردی - پۆلی یەکەمی بنەڕەتی، وەرزی یەکەم، چاپی پێنجەم.

14. لێژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە، (٢٠١٨)، خوێندنەوەی کوردی پۆلی دووەمی بنەڕەتی، چاپی یانزەم.

15. لێژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە، (٢٠١٨)، خوێندنەوەی کوردی پۆلی سێیەمی بنەڕەتی، چاپی یانزەم.

16. ئەبابەکر، کامەران ، ٢٠١٨، کۆوانە - خاڵبەندی.

زمانی عەرەبی

1- عاشور، راتب قاسم، محمد فؤاد الحوامدة (٢٠١٤), أساليب تدريس اللغة العربية بين النظرية والتطبيق، الطبعة الرابعة، دار الميسرة للنشر و التوزيـع، عمّان.

ئەم کتێبە لەلایەن دەزگای ڕوانگە،
لە چوارچێوەی پرۆژەی کتێبی ڕوانگە، چاپ کراوە.

کتێبی ڕوانگە پرۆژەی ساڵانەی دەزگای ڕوانگەیە و هانی نووسەران دەدات بۆ بەشداریکردن لەڕێگەی نووسینی کتێب. پرۆژەکە کێبرکێیەک ساز دەکات لەنێوان نووسەراندا، کە لە کۆتایی پرۆژەکەدا باشترین کتێب هەڵدەبژێردرێن و لەسەر ئەرکی دەزگای ڕوانگە چاپدەکرێن و بڵاو دەکرێنەوە.

ئامانجی پرۆژەکە هاندانی نووسەران و لاوانە بۆ نووسینی کتێب و لێکۆڵینەوە و دەستنیشانکردن و خستنەڕووی هۆکار و چارەسەرەکان. هەروەها فەراهەمکردنی سەرچاوەی زیاتر و فراوانترکردنی کتێبخانەی کوردییە.


بۆ زانیاری سەبارەت بە پرۆژەکە

www.rwanga.org
٠٧٥٠٢٩٦٠٢٢٢
Book@rwanga.org

ئـەم کتێبـە گرنگـی دەدات بـە ڕێـگا و شـێوازەکانی وانەگوتنـەوەی سـەردەمی. لـەم چوارچێوەیەشـدا ڕێگاکانـی گوتنـەوەی ڕێنـووس دەگرێتـە خـۆی. ئاماتـج لـە نووسـینی ئـەم کتێبـە بریتییـە لـە هەڵبژاردنـی باشـترین شـێواز بـۆ گوتنـەوەی ڕێنـووس لـە بازنـەی یەکەمـی خوێنـدن، چونکـە ئەگـەر لـەم قۆناغـە قوتابـی پیتەکەیەنرێـت و لێکـدان و شیکردنەوە و ڕوتەڵکردنی پیتەکانی فێرنەکرێت، ئەستەمە لـە قۆناغەکانـی تـر فێربێـت بێگومـان پرۆسـەی فێربـوون و فێرکردنیـش لەسـەر بنەمـای ڕابەرایەتـی و ئاراسـتەکردن بێـت زۆر باشـتر و کاریگەرتـرە لـەوەی بـە شـێوەی هەرەمـە کـی بێـت. پێویسـتە قوتابـی هەوڵبـدات زۆرتریـن سـوود لـەو ڕێنماییانە وەربگرێت کـە مامۆستا لـە ناو پۆل ئاراسـتەی دە کات. جا ئـەم ڕێنماییانـە بـۆ خوێنـدن و وانەکاتی پەیوەیسـت بە قوتابخانە بێت، یان ڕێنمایی بێت بۆ ژیانی قوتابی.



سامان مام عەبدوڵڵا
نووسەر و مامۆستای زانکۆ

سامان مام عەبدوڵا نووسەر و مامۆستایە لە زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر، یەکێکە لە چالاکوان و خۆبەخشەکانی شاری هەولێر ،ماوەی ٨ ساڵە وەک خۆبەخش کاردەکات بۆ بەرزکردنەوەی تواناکانی گەنجان

---

ئەم کتێبە لە لایەن دەزگای ڕوانگە، لە چوارچێوەی پرۆژەی کتێبی ڕوانگە چاپ کراوە.